# برگەو بنەماکانی پۆستمۆدێرنیزم

نوسینی: عەلی ئەسغەر قەرەباغی

وەرگێڕانی: عەلی ئازەرنیا

پۆستمۆدێرنیزم ئەو دیاردە هەمەگیرەیە، کەتارماییەکەی باڵی بەسەر جیهانی ئەمڕۆدا کێشاوەو وەك دەستەواژەیەك بۆ وەسفکردنی گۆڕانە بەربڵاوەکانی چەند دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم باسی لێوە دەکرێت. وێڕای ئەوەی کە تائێستاش پێناسەیەکی دیاریکراو سەبارەت بەم دیاردەیە نەدراوە بەدەستەوە بەڵام ئەو راستیە قبوڵکراوە کەهەلومەرجێك بەناوی "پۆستمۆدێرنیزم"ەوە لەئارادایە. دەیەی ١٩٨٠ قۆناغی هێرشو گەشەسەندنو لەهەمانکاتدا گۆڕانی پۆستمۆدێرنیزم بوو. لەگەڵ ئەوەی لەماوەیەکی کورتدا چەندین جار روخساری خۆی گۆڕیو تەنانەت لەسەرە مەرگیش نزیك بۆوە، کەچی بەردەوام درێژەی بەگەشەکردنی خۆیدا. (ئیهاب حەسەن) کەیەکێکە لەوانەی بانگەشە بۆ پۆستمۆدێرنیزم دەکات لەساڵی ١٩٨٧ دا، نوسی:" سەردەمانێك ئەکادیمیستەکانی مەلا نوقتی خۆیان لەبەکارهێنانی وشەی پۆستمۆدیرنیزم دەپاراست، کەچی ئەمڕۆ ئەم وشەیە وەك تاقیکردنەوەی خولیاکان لەهونەرو فەلسەفەو بیناسازیو سەماو مۆسیقادا کارایی هەیە. تەنانەت دەرونزانی، زانستی ئایینی، مێژوو، زانستو تەکنەلۆژیاش بەدەر لەئەندێشە پۆستمۆدێرنستیەکان نەبووە". لەڕاستیدا سەرەڕای ئەوانەی ئاماژەمان پێدانپۆستمۆدێرنیزم کاریگەری لەسەر تەواوی لایەنەکانی ژیان داناوە لەوانە: سیاسەت، ئابوری، ئایین، ئەخلاقیات، ڕایەڵەو میدیاکانو تەنانەت "بونیادی هەست"و پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانیش.

هەندێ لەفەیلەسوفانی پۆستمۆدێرنیزم، بۆنمونە فردریك جیمسۆنو ژان بۆ دریار، قۆناغی پۆستمۆدێرنیزم وەك حاڵەتی (پچڕانی دەرونی نوێی زەمەنو فەزا) پێناسە دەکەن. گریك ئۆئێنزو کانت فرامپتون بە"روداو"ێکی دەزانن کەرێکەوڕاست " لەگەڵ رمانی حەماسەتو باڵادەستی مۆدێرنیزمدا رویدا". رۆزا لیندا کراوسو داگلاس گریمپ، ئیدوارد سەعیدو گریگۆری ئالمێر، بەچاوی"چەمکی بان ڕەخنەیی"و "سیاسەتی لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەمڕۆ" سەیری دەکەن.

مەبەست لەهێنانەوەی ئەم نمونانە ئەوەیە کە لەلایەك ئاماژە بەوەبکەین کە پۆستمۆدێرن ناچێتە قاڵبی هیچ پێناسەیەکەوەو لەلایەکی تریشەوە پەنجەبخەینە سەر ماهیەتی ئەم دیاردەیە کەبەردەوام لەگۆڕاندایە. گۆڕانکاریەکانی پۆستمۆدێرنیزم هێندە بەگوڕو خێرا روو دەدەن کەبەڕاشکاوی ئەتواندرێ بگوترێ، پۆستمۆدێرنیزمی ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوشتەی کە لەسەرەتادا بەم ناوە دەناسرا یاخود تەنانەت لەگەڵ پۆستمۆدێرنیزمی دە پانزە ساڵ لەمەوبەریشدا زۆر جیاوازە. پۆستمۆدێرنیزمی سەردەمی مارگرێت تاتشەرو ڕێگان کە لەئەمریکای لاتین بەگشتیو بەتایبەتیش لەئەرجەنتینو بەرازیلو مەکسیك بەپۆستمۆدێرنیزمی "راست" ناسراوە، لەبازرگانی ئازادو تیرۆریزمو بڵاوبونەوەی مادە سڕکەرەکان بەولاوە هیچ دیاریەکی تری پێنەبوو، لەکۆلۆمبیا بوەهۆی پەرەگرتنی کلتوری ڕۆكو پانكو کۆکایین، تاوای لێهات ئۆکتاڤیۆ پاز لەم بارەیەوە بڵێت: ئەم پرۆژەیە بەکەڵکی ئەمریکای لاتین نایەت. بەڵام کاتێك پۆستمۆدێرنیزمی "چەپ" سەریهەڵداو کەوتە ململانێ لەگەڵ ئەوشتانەی پۆستمۆدێرنیزمی "راست" بڵاویدەکردەوە، بووە کەرەستەیەکی بەکار لەپێناو نوێکردنەوەو وەزە بەخشین بەدروشمە سواوو بزڕکاوەکان. ڕێکخراوە جەماوەریەکان پێکهاتنو باڵەکلتوریەکان پەیدابون، یەکێك لەو نمونانەش بزوتنەوەی(چیکۆ مێندز) بوو لەناوچەی ئامازۆن. لەگواتیمالاشدا (ڕێگا برتۆ منچۆ) سەرنجیدایە چەمکی بەرگری خەڵکی ئەو ناوچەیەو پۆستمۆدێرنیزمی گۆڕی بۆ کلتوری ململانێکردن. پێشکەوتنی ژنانی بەرازیل، جوڵانەوەی پێشکەوتنخوازە حاشاهەڵنەگرەکانی فنزوێلا، هەروەها دەرکەوتنی حیزبو گروپە کلتوریەکان، ئەمانە هەموی نمونەی بەرهەمی پۆستمۆدێرنیزمی"چەپ"ن[1] لەوڵاتانی ئاسیای باشوری خۆرهەڵاتدا. شێوەی کلتورێکی ئابوری نوێی بەخۆیەوە گرت کەپاپەندە بەبنەمای قەڵبو قەڵبسازیەوە. لەتایوانو سەنگاپورەو مالیزیادا کاڵا قەڵبەکان بەشێوەیەك دروستدەکەن کەجیا کردنەوەی کاڵای راستەقینە لەکاڵا ساختەو قەڵبەکان، تەنانەت بۆ خودی دروستکەرە راستەقینەکانیش کارێکی ئەستەمو مەحاڵە.

ماهیەتی پۆستمۆدێرنیزم بەجۆرێکە کەبەردەوام لەحاڵی گۆڕینی روخساری خۆیدایە، هەر بۆیە پێویستە بەردەوام لەدوایین گۆڕانکاریو دیدگاکانی بەئاگابین، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تاکو ئێستا لەوڵاتی ئێمە شێوازی سەرەتایی ئەم دیاردەیە بەتەواوی نەناسراوەو نەخراوەتە بەر توێژینە وەك ئەوەی کە ئەوە چارەنوسی حەتمیانەی کلتوری ئێمە بێت کەتەنها لەروکەشی شتەکان بڕوانینو سەردێڕو مانشێتی بابەتەکان بخوێنینەوەو دڵمان بەکەلتوری زارەکی خۆشبکەینو هەموو شتێك پشتگوێ بخەین، پاشان بڵێین لەڕوداوە کلتوریە جیهانیەکان بەئاگاین. لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێین کەناکرێ بەتەنها خوێنەر تاوانبار بکەین چونکە کێشەکان لەگەڵ زۆربەی ئەو دەقانەی تاکو ئێستا نوسراون یاخود وەرگێڕدراون لەوەوە سەرچاوە دەگرن کەدیدی ئەوکتێبو گوتارانەی لەڕۆژئاوادا بەتیراژێکی کەمو، زیاتریش لەلایەن زانکۆکانەوە بڵاودەکرێنەوە، ڕویان لەخوێنەری خۆرئاوایەو هەریەکەیان سەرقاڵی وردەکاریو ڕەخنەگەلێکە

خوێنەری خۆرئاوایی ئاشنایە بەنەخشەی گشتیو نیوەی گوتارەکانی. خوێندنەوەی ئەم دەقە وەرگێڕدراوانە، هەرچەند وەرگێڕانەکەشیان بەوردیو بەماندووبوونەوە ئەنجامدرابێت، بەهۆی نائاشنایی لەگەڵ باکگراوندی هەمان نەخشەی گشتیدا، لەسەر لێشێواویو بێزاری بەولاوە ئاکامێکی تری نابێتو خوێنەر دەرەقەتی نایەت. چونکە لەدەقەکەدا ئاماژە بەنیوە بەشە بنەڕەتیو سەرەکیەکە نەکراوە، بەشێکی بەهۆی ڕەوان نەبوونی وەرگێڕانەکانەوە نامەفهومەو بەشەکەی تری بەهۆی نائاشنایی بەو زاراوانەی تیایدا بەکارهاتون، خوێنەر دوچاری کێشە دەکەن . ئەوەشی کەدەمێنێتەوە هێندێك وشەو دروشمی نامۆیە. کارەساتەکە کاتێك دەستپێدەکات کە خوێنەر بکەوێتە گومانی ئەوەی لەخوێندنەوەی دەقەکە شتێکی هەڵکڕاندوەو بیەوێت تێگەیشتنەکانی خۆی بۆ کەسانی دی بگوازێتەوە.

بەهەرحاڵ، هەر ئەم گوێنەدانو کەمتەرخەمیە واقیعێك بەرجەستەدەکات کە لەڕاستیدا جۆرێك لەخراپ تێگەیشتنە. زۆرن ئەوانەی خۆیان بەڕوناکبیر دەزانن‌و دەڵین: کاتیك ئیمە تائیستاش بەمۆدیرنیزم ئاشنا نەبوین‌و بەتەواوی تاقیمان نەکردۆتەوەو هەنوکەش لەگەڵ زۆریك لەدیاردەو بەرهەمەکانی قۆناغی پیش مۆدیرنیزمدا دەژین، کوا پیویستمان بەپۆستمۆدیرنیزم هەیە! پۆستمۆدیرنیزم چی بوو کە ئەمرۆ پۆستمۆدیرنیزم بیت! نەپیشەسازی یەکپارچەو نەتەکنەلۆژیامان تاقیکردۆتەوە، نەکشتوکالی مۆدیرنمان هەیەو نەلایەن‌و ریکخراوی کۆمەلاّیەتی- سیاسی کە لانیکەم لەروالەتدا بەعەقلاّنیەتەوە بەندبیت. خراپ تیگەیشتنی تر کە لەناو ستافی فەرهەنگو هونەردا باوە، ترسانە لەو ئەگەرەی کە نەکا پۆستمۆدیرنیزم شوینی مۆدیرنیزم بگریتەوە، بەلاّم نابی ئەم خراپ تیگەیشتنانە ببنەهۆی کەمتەرخەمیو بەهانەیەك بۆ نائاشناییو نەناسینی ئەم دیاردەیە.

هەرگیز هەژاری فیکرییو فەلسەفیو نەزانی دەبارەی هەر چەمکیك، نەبۆتە مایەی شانازیو زانایی. ئۆکتاڤیۆ پاز، کەدەیگوت پۆستمۆدیرنیزم بەکەلکی ئیمە نایەت، پۆستمۆدیرنیزمی ناسیبوو، بەلاّم ئیمە چی؟ ئایا ئیمەش هەمان شارەزاییمان هەیە یان دەبی دلی خۆمان بەفەرهەنگی شەفەویو زارەکی خۆشبکەین‌و هەمان گوتەی پاز دوبارە بکەینەوە؟ ئایا رەوایە وەکچۆن دەستی دەستیمان بەمۆدیرنیزم کرد ئاوهاش دەەستی دەستی بە پۆستمۆدیرنیزم بکەین، تا چل پەنجا سالیك بەسەرماندا تیپەریتو تازە تیبگەین کەئاشنای دیاردەیەکی گەردونی نەبوین‌و کاتیکش ببینەوە سەرخۆ ببینین ئیدی بووینەتە بازاریك بۆ بەکارهینانی کالاّ بیکەلكو بەسەرچوەکان؟ ئەدی ئەوەنیە زۆریك لەو هونەرمەندەکانمان، ملە چەماوەکانی پیکاسۆ بەلوتکەی مۆدیرنیزم دەزانن‌و ئیستاش، کە ئیستایە، لاسایی دەکەنەوە؟ ئەوەتا، ئیستاش رەنگ تیکەلّ دەکەن‌و خۆیان دەخەنە ئەو گومانەی کەوینەی تەجریدی دەکیشن؟

ئایا ژمارەی ئەو کۆلکە وینەکیشانە کەمن، کە بەخەیالی خۆبەمۆدیرنزانی، خۆیان بەدەست خاووخلیچك دەنوینن‌و کارامەییو شارەزایی هونەری وینەکیشان، بەهاوشانی خۆیان نازانن؟ دەکرا تارادەیەك گوی بەمۆدیرنیزم نەدریت، ئەویش بەهۆی ئەو تایبەتمەندیانەی کە هەیبوو، بەلاّم ماهیەتی پۆستمۆدیرنیزم بەجۆریکە کە ناتواندری بەهیند نەگیریتو پشتگوی بخریت. فەرموی ئیمەیان نەکردوە بۆ سەر خوانی پۆستمۆدیرنیزم تابلیین جاری حەزمان لینیەو بابۆ دوایی بیت. چاك یان خراپ، خوازراو یان نەخوازراو، بەسەرماندا سەپیندراوەو لەتان‌و پۆی ژیانماندا تەنراوە. دیویکی بەلەسەبوی سەرکیشەو تارماییەکەی لەهەموو شوینیکدا بەدیدەکریتو گەورەو بچوکیش ناناسیت. پۆستمۆدیرنیزم لەو هەوایەدا کەهەلی دەمژین، ئەو بەهانەیەش کەدەلین پۆستمۆدیرنیزم تایبەتە بەجیهانی خۆرئاواوە قبولناکریت، چونکە کاریگەریەکانی لەهەموو شوینیکی گۆی زەویدا رەنگیان داوەتەوەو ئەم مۆدیلە روناکبیریە هاوچەرخە، هەمەگیرترین‌و بی وینەترین هیرشی کلتورییە بۆ سەر کۆمەلگە ناخۆرئاواییەکان. لەبەرئەوەی کەپۆستمۆدیرنیزم لەژیر ناوی تیۆریکی ئازادیخوازدا، بەروالەت پشتیوانی لەپەیڤی فرەلایەن‌و دیاردە فرە کلتوریەکان‌و هونەری دوورەگە دەکات، تەنانەت سەرنجدەداتە هونەری خۆجییو فۆلکۆریش، ئەوا تەواوی جیهان دەگریتەوە. ئاشکرایە کە سەرنجدان لەهونەری گەلانی نائەوروپایی، واتە ئەوانەی کە بەردەوام "ئەوانی دی" بوون‌و لەسەرانسەری میژودا بەرەو پەراویز راونراون، شتیکی سەیرو سەرنج راکیشە. ئەگەرچی وەك ماست بەلیوانەوە دیارە کەدواجار پۆستمۆدیرنیزم جگە لەخستنە پەراویزی راستیە نا خۆرئاواییەکان مەبەستیکی تری نیەو دەبی لەکۆلۆنیالیزم‌و مۆدیرنیتەدا بەدوای رەگوریشەکانیدا بگەریین، کەوابوو بۆ گەیشتن بەهەلسەنگاندنیکی دروستو گونجاو، پیویستمان بەناسینی تەواوی فاکتەرو رەهەندەکانی ئەم دیاردەیە هەیە. تا ئەو دەمەی کەبەدروستی نەیناسین، ناتوانین پەنجە بخەینە سەر لایەنە سلبیو ئیجابیەکانیو داکۆکیکردنیشمان شتیکی هەوەنتەیەو دواجار لەدوبارەکردنەوەی مانای کلتوریکی سەرزارەکی تیپەر ناکات. تا زیاتر لەگویی گادا بخەوین‌و نا ئاشناترببن بەم دیاردەیە، ئەوا زەرەرو زیانی زۆرتر بەخۆمان‌و هونەرو کلتورەکەمان دەگەیەنین. دەبێ ئەو راستیەش لەبەرچاو بگرین کە خوێندنەوەو وردبونەوە لەپۆستمۆدێرنیزم دەبێتە هۆی پێداچونەوەو فەراهەمکردنی زەمینە بۆ خوێندنەوەی پەیوەندیەکانی نێوان مۆدێرنیزم‌و پۆستمۆدێرنیزم.

ئەوەی کە ئێمە لەسەردەمی پۆستمۆدێرنیزمدا دەژین گرێدراوە بەهەندێ برگەو بنەمای گشتیەوە.

١- ئەمرۆ ئیتر بەشێك لە ئەندێشەکانی پێشکەوتن‌و عەقلاّنیبونی مەسەلەکان‌و ئەوەی کە مۆدێرنیتەی خۆرئاوای دروستکردو شەرعیەتی پێبەخشی، شیاوی قبولّکردن نین، چونکە لەتیۆرو لێکدانەوەکانی خۆیدا، جیاوازیە کلتورییو کۆمەلاّیەتیەکانی نەتەوەو گەلانی جۆر بەجۆری لەبەر چاو نەگرتوە.

٢- رۆژگارێك وادەزانرا دۆزینەوە زانستیەکان‌و گەشەسەندنی ئابوری، گەر لەخزمەت مرۆڤدا بن، ئەوا شەرعیەت پەیدا دەکەن؛ بەلاّم ئەمرۆ دوای چەندین سەدە دیاردەگەلێکی حاشا هەلّنەگرهەن ئەو راستیە دەسەلێنن کەپێشکەوتنەکان بەتەنها لەبەرژەوەندی گروپە تایبەتەکاندا بون‌و هەرگیز نەیانتوانیوە رێگە

لەدەستدرێژیو تاوانی دژ بەمرۆڤایەتی بگرن. پێشکەوتنی زانستو تەکنەلۆژیا نەك هەر بووە مایەی چەندین نەخۆشی، بگرە ناسنامە مرۆڤایەتیەکانی تـاكو کۆمەڵیشی لەفکرد.

ئەمرۆ مرۆڤ لەبەرامبەر زانستو تەکنەلۆژیادا، گالیڤەرێکە*، هەندێ جار لەڕادەبەدەر گەورەو هەندێ جاریش لەڕادە بەدەر بچوکەو هەرگیز قـەبارەی پـڕ بەپێستی خۆی وەر نەگرتوە. لەم ڕووەوە مرۆڤەکان بەسەر دوگروپی جیاوازدا دابەشدەکرێن: گروپێك دەچنـە شـەڕی ئالۆزییـەکانو گروپێکـی تـر، پـێ بـەکۆتو زنجیری هەمان هەوڵو کۆششەکانی چاخی بەردین لەپێناو شەڕی مانەوە، لەمەیدانی ژیاندا ئێشك دەگرن. ئەمە یەکێکە لەلایەنە بەئێشو ئازارەکانی شکسـتی پرۆژەی مۆدێرن، کە بڕیار وابوو ببێتە پیشتیوانی سەرجەم مرۆڤایەتی.

٣- ئێستا ئیتر هیچ دڵنیاییەك سەبارەت بەو شتە نیە، کەبەکلتوری باڵاو سەروەرو پێشڕەو ناودەبرێتو، بەهادارتربێت لەکلتورە هـەژارترو کلتـوری ڕەشـۆکیو وردە کلتورۆکەو تەنانەت کلتورە ناوچەییە خۆجێیەکانیش.

٤- لەبارودۆخی مێژویی تەکنەلۆژیای ئەمرۆدا چیدی "راسـتەقینە"و "کۆپـی"، "سروشـتی"و "دەسـتکرد" لێکجیاناکرێنـەوە. تەکنـەلۆژیا بەرهەمهێنـەری زانیاریو بلاوکەرەوەی ئێمەیجەکانەو بەسەر هەموو شتێکدا زاڵبوە . ئەمڕۆ لەقۆناغی سیسـتەمی سێهەمی مۆدێرنـیزم، واتـە لەسـەردەمی "Simulation " مۆدێلو نمونـەکاندا دەژیـن. لـەم سیسـتەمەدا کـە لـەدوای دووەم جـەنگی جیهانییـەوە پێکـهات، بنـەمای تیـۆری سیسـتەمی دەسـەلات گـۆڕدراو، هێماگـەریی بونیادییانە جێی ئابوری سیاسی مارکسی گرتەوە. ریکلامو پڕوپاگەندەو زانیاریو میدیاو تۆڕەکـانی تـری پـەیوەندی واتـە ئەوشـتەی کـەجاران وەك بەشـێکی لاوەکی لەقەڵەم ئەدرا، ئێستا شێوەی بنەڕەتی ترین بەشی بەخۆیەوەگرتوە. بەواتایەکی تر؛ نمونەو کلێشـەو هێماکـان شـوێنی بـەهاو چلۆنایـەتیو کـارایی بـەر هەمەکانیان گرتۆتەوە.

پێشتر وتمان کە پۆستمۆدێرنیزم لەدوو دەیەی کۆتاییدا دوچاری گۆڕانی بنەڕەتی هاتوەو، پێویستە لێرەدا ئاماژە بەهۆکارەکانیشی بکەین. پۆستمۆدێرنیزم زادەی جوڵانەوەی ڕەخنـەیی خۆرئاوایـە لەهونـەرو تەلاسـازیدا، کـە چـاودێرە بەسـەر پەرچەکردارگـەلی راشـکاوانە لـەدژی دەسـەلاتی خنکێنـەری مۆدێرنـیزمو عەقلانیەتی ئاماڵجخوازو بلاوبونەوەی هێلێکی ئەندێشەیی کۆنو سواوی بڕوا بەسەروەر بونی نوخبەگەرایی کلتوری. راپەڕینێکە لەدژی جوڵانەوەی رۆشـنگەری سەدەی هەژدەهەم کەبەنیاز بوو تەواوی هەڵوێستو ئەندێشە مرۆییەکان لەچوارچێوەی ئەندێشەیەکی دیاریکراوی عـەقڵو عـەقلانیەتدا بگونجێنێت. هەمان ئـەو جوڵانەوە رۆشنگەریەی کەدەیویست بەگوێرەی شارستانیەتو کلتورو کۆمەڵگەی خۆی گەزو تەراو زویـەك بـۆ پێوانـە کـردنو هەڵسـەنگاندنی شارسـتانیەتو کلتورو ئەندێشەکانی تر بدات بەدەستەوە. پۆستمۆدێرنیزم لەسەرەتادا جوڵانەوەیەك بوو لەدژی ئـەو ئەندێشـە پـاوانخوازەی کـەخۆر ئـاوا، لـەدوو تـوێی کلتـورو شارستانیەتەوە نەخشەی بۆکێشابوو. دەیویست تەواوی نەژاد و نەتەوەو چینو توێژەکان بگرێتەوە، هـەر بۆیـەش هـەوڵی ئـەوەیدا کـەلێرەو لـەوێ هێندێـك شـت هەڵبژێرێتو ئاوێتەی یەکتریان بکات. بەلام لەئاکامی ئەمەدا، زاتو ماهیەتی خودی خۆشی دوچاری گۆڕان هـات. هێندێـك لـەڕوداوە سـەرەکیەکانی بـواری زانسـتیو کلتـوریو کۆمەلاّیـەتیو رۆشـنگەری دوودەهـەی ڕابـردو، نـەك هـەر بناغـەو بنـاوانی مۆدێرنیتـەیان وێرانکـرد، بگـرە ماهیـەتو ناسـنامەی پۆستمۆدێرنیزمیشیان گۆڕی، کەئەوانیش بریتین لەمانەی خوارەوە؛

١- ئاشکراکردنی روی بابەتیانەی زانستی لەنوسینەکانی تامس کۆهن، پۆل فیرابندو هەندی لەرەخنەگرە مارکسـیەکانی تـردا، کەدەسـتیانکرد بەرەخنـەگرتن لەزانستەکان.

٢- دارمـانی هەمەلایەنەی فەلسەفەی دێرینی خۆرئاواو کەمبونەوەی بایـەخی ئـەو فەلسـەفانە لەنوسـینەکانی وەچەیـەکی نویـی فەیلەسـوفانی وەك لۆدڤیـك ڤیتگنشتاینو ژاك دریداو ژان بۆ دریارو ریچارد رۆتیو..

٣- پیداگری لەسەر بی سنوریی فیزیای کوانتۆمو ماتماتیك.

٤- پیداگری لەسەر پچرانو نایەکسانیو بەردەوام نەبوونو هەبوونی جیاوازیە حاشا هەڵنەگرەکان لەمیژوودا. نوسینەکانی میشـیل فۆکـۆ نمونـەی دیـاری ئـەم پیداگریانەن.

٥- پەلهاویشتنی ریبازی "ریالیزمی جادویی" بەسەرکردایەتی بۆرخسو مارکیزو هەندی لەچیرۆکنوسانی ئەمریکای لاتین.

٦- پیداگری لەسەر گوتاری "ئەوانی دی"و نواندنەوەیان لەمیژوو، هونەر، مرۆڤناسی، کۆمەلناسیو سیاسەتدا.

٧- عـەلمانی کردنو بەهیند نەگرتنی مەسیحیەتو وەدەرنانی لە کۆمەلگەی خۆرئاوا، وەك هیزیکی بەتوانای ئەخلاقی.

٨- سەرکەوتنی ئابوری بازارو دەرکەوتنی سەغلەتیەکانی زیان شوناسیو پەیدابدونی دیاردەیەك بەناوی "هەلبژاردنی بەکارهین".

ئەم گۆرانکاریانە ناسنامەیەکی تازەیان بەپۆستمۆدیرنیزم بەخشی، هەربۆیە ئیتر پۆستمۆدیرنیزم بەتەنها بیر لەسـەر نگونکردنـی ئەندیشـەی رۆشـنگەریو عەقلانیەتو دەنگبەخشین بەبیدەنگیەکان ناکاتەوە. خۆی بەهونەرو تەلارسازیشەوە نەبەستۆتەوەو، ئەو سنورەی بەزاندوە. کەسایەتیەکی فرەلایەنو فرەروخساری بەخۆیەوەگرتوەو رەگوریشەگەلیکی لەتانوپۆی ژیانی رۆژانەی خەلکدا تەنیوە. کەدەبی بەجیا لەهەر کامیان بکۆلینەوە.

مەبەستمان ئەوەیە کە لەزنجیرە بابەتێکدا، بەپێی تواناو بەزمانێکی ساکار وێڕای ئاشنابون بەڕەچەڵەك‌و پێناسەی پۆستمۆدێرنیزم، (هەرچەند ناچێتە قالبی‌و هیچ پێناسەیەکەوە) چاك‌و خراپ‌و ڕۆڵ‌و کارابیەکەی لەبوارە کلتوری‌و هونەریەکاندا بخەینە بەر توێژینەوە، بەڵام بەر لەوەی بچینە سەر باسی پۆستمۆدێرنیزم. پێویستە لەلایەك بەبڕگەو بنەما تیۆریەکانی ئاشنابین‌و لەلایەکی ترەوە، بەکورتی، ئەو ماناو دەستەواژانە بناسین کە لەمەو دوا بەرچاومان دەکەون. ئەگەر بمانەوێت بەپۆستمۆدێرنیزم ئاشنابین، دەبێت سەرەتا بڕگەو بنەماکانی مۆدێرنەو مۆدێرنیزم بزانین‌و لەجیاوازی نێوان مۆدێرنیتەو مۆدێرنیزەیش بەئاگابین، چونکە لەزۆربەی تێکستە فارسیەکاندا ئەم دەستەواژانە جێگۆڕکێیان کردوەو بەپێی سەلیقەی تاکەکەس خراونەتە نێو دەقەکانەوە. هەروەها دەبێ ئاماژە بەو خاڵەش بکەین کەئەوەی لەشیکردنەوەو پێناسەکردنی ئەم دەستەواژانەدا ڕونیدەکەینەوە گەلێك کورتەو هەندێ جار لەسنوری هونەرە شێوەکاریەکان تێپەڕناکات. بۆ ناسینی هەموو ڕەهەندەکانی پۆستمۆدێرنیزم، ئاشنابونی زیاتر بەپێناسەگەلی گشتی تری ئەم دەستەواژانە زۆر پێویستی.

هەرچەندە دوبارەیە، بەڵام بەرلەوەی لەبڕگەکانی پۆستمۆدێرنیزم وردبینەوە ئەمڕۆ دەبێ چاوەڕوانیکردنی دۆزینەوەی پێناسەیەکی تۆکمەو گشتی دەربارەی پۆستمۆدێرنیزم لەکەللەی خۆمان وەدەرنێین. پۆستمۆدێرنیزم ئەو پەریزادە ئەفسانەییەنیەکە تاریك‌و ڕونی بەیانی بینین‌و دەرزیەك بەنێو چەوانیەوە بکەین‌و بیکەین بەخزمەتگوزارو فەرمانبەرداری خۆمان. ئاڵۆز ترو قۆڵهەڵماڵراو ترە لەوەی کەبچێتە ژێر باری پێناسەیەکی دیاریکراوە وە. ئاڵۆزیەکەشی لەوەدایە کە لەگەڵ هەموو شتێکدا هەم کۆك‌و گونجاوەو هەم دژو ناکۆکە. دژایەتی لەگەڵ مۆدێرنیزمدا دەکات کەچی ناوی خۆی لەوەوە وەردەگرێت. سروشتی ئاوێتەگەری پۆستمۆدێرنیزم، شێوەیەکی تری لەڕازو نهێنی پێبەخشیوەو لەم ڕوەوە وەك هێزێکی روناکبیری "کردە باوەڕ" رەفتار دەکات کەنەك هەر ناتواندرێ پەی بەگەوهەرەکەی ببرێت، بەڵکو پێدەچێت بەرگریکردن لەبەرامبەر هەندێ لەڕەهەندەکانی رەنگە شتێکی مەحاڵ بێت. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، من لەو باوەڕەدام خستنەڕوی روخساری پۆستمۆدێرنیزم‌و ئاشنابوون بەبڕگەکانی، دەتوانێ ڕۆڵێکی یارمەتیدەر بگێڕێت.

## بڕگەکانی پۆستمۆدێرنیزم

پۆستمۆدێرنیزم، هەروەك لەناوەکەیەوە دیارە "پۆستمۆدێرنیتە"یە. واتە ئیدیعای بەجێهێشتنی مۆدێرنیتەیەك دەکات کە بازیداوە بەسەر کۆندا. کەوابوو، بڕگەی یەکەمی پۆستمۆدێرنیزم ئەوەیەکە ئەوشتەی لە مۆدێرنیتەدا جێی متمانەبوە، لەسەردەمی پۆستمۆدێرندا سواوبێ متمانەیە. مۆدێرنیتە ئەچوە قالبێکەوە کە لەزمانی پیشەیی خوێندنەوە کلتوریەکاندا، بە"بان ریوایە" یان "ڕیوایەی گەورە" ناودەبرا. واتا ئەندێشە گەورەکانی وەك "عەقڵ"، "حەقیقە"، "کەلەپور"، "ئەخلاقیات"و "مێژوو" کەڕەوتی ژیانیان دیاریدەکردو مانایان پێدەبەخشی. بەڵام پۆستمۆدێرنیزم پێیوایە لەبەر ئەوەی ئەم مانایانە، لەگەڵ وردەکاریەکانی شیکاری‌و توێژینەوەی ئەمڕۆدا ناسازگارە، ئەوا ناوەڕۆکی خۆیان بەتەواوی لەدەستداوەو سەرجەم ئەو بۆچونانەی کە بەچەمکە رەهاکانی حەقیقەت‌و ئایین‌و زانست‌و عەقڵەوە بەندن لەمشتێك شتی دەستکرد بەو لاوە هیچی ترنین‌و هەمویان ماهیەتێکی تۆتالیتارانەیان هەیە. حەقیقەت ڕێژەییەو لەگەڵ ئەگەرو پێدوایستیەکانی خۆیدا، دەبێتە دراوسێی دیوار بەدیواری زۆرێك لەماناکانی تر. یاخود بەپێی بۆ چونی (ڕیچارد رۆتی) کە یەکێکە لەو جەمسەرانەی پۆستمۆدێرنیستەکان دەیپەرەستن، پێی وایە هیچ شتێك، سروشتێکی زاتی‌و گەوهەری تێدا بەدی ناکرێت کە بتواندرێ راڤە بکرێت‌و دەربڕدرێت‌و هەموو شتێك بەرهەمی زەمەن‌و ڕێکەوتە. کەواتە یەکێك لەبڕگەکانی پۆستمۆدێرنیزم نکۆلیکردنە لە حەقیقەت‌و هەموو شتێك بەنسبی دەزانێت. ئەوەی لێرەدا جێی پرسیارە ئەوەیەکە ئەگەر عەقڵ‌و حەقیقەت لەئارادا نەبێت، زانست چ مانایەکی دەبێت؟ بەم پێیە، پۆستمۆدێرنیزم بەچاوی گومانێکی یەکسانەوە لەسەرجەم زانست‌و سەرچاوەکانی دەڕوانێت، هیچ جیاوازیەك لەنێوان زانست‌و جادو گەریدا نابینێت‌و وایدەبینێت کەزانست لەڕێگەی گەڕان‌و توێژینەوەوە دەستەبەر نابێت، بەڵکو لەڕێگەی تەسەوراتەوە فێردەبین. هەر بۆیە ئەفسانە لە فەلسەفە بەچاکتر دەزانێت‌و ڕیوایەی بەلاوە باشترە لەتیۆر، چونکە هەردوکیان لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤ کاریگەری زیاترو قوڵتریان هەیە. ڤیتگنشتاین لای وابوو هەر چیەك کەهەمانە لەزمانەوەیەو هەر ئەم زمانەش، کاتیك دەیەوێ راستیەك شیبکاتەوە، تەنانەت لەلیهاتوانەترین‌و کارامەترین شیوەی خۆیدا، تژییە لەهەڵەو گومان. کەواتە ئایرۆنی باشترین کەرەستەیە کەمرۆڤ لەریگەیەوە مەبەستی خۆی دەربڕیت.

بڕگەی دووەمی پۆستمۆدیرنیزم نکۆلیکردنە لەراستی. باس لەوەدەکات کە هیچ راستیەکی یەکجارەکی بونی نیەو، مرۆڤ لەو دیوی شتەکانەوە هەمان شت دەبینیت کەدەیەوی ببینیت، ئەمەش گریدراوە بەبارو دۆخی کات‌و شوین‌و بەوەشەوە کە تا چ رادەیەك‌و ریگەی بینینی چ شتیك بەمرۆڤ دراوەو چەمکی کلتوری میژووی لەسەر چ شتیك چەقیبەستبیت. لەمروەوە، تەنانەت لەزانستیشدا، ئاسانترین شت بۆ دۆزینەوە هەر ئەو شتەیەکە مرۆڤ بەدوایدا گەراوە. چەندە زانست لەدوایین ئامانجەکانی نزیکتربیتەوە، هیندەش لەپۆلینکردنی "تیۆری هەموو شتیك" واتە لە رەهەندە پۆستمۆدیرنیستیەکانی خۆی نزیکتردەبیتەوە. میکانیکی کوانتۆم دەمیکە شوینپیی گوتاری نیسبیەتی لەناوەندی زانستدا کردۆتەوە. تیشك توانی هاوکات هەم شەپۆل بیت‌و هەم

گەردیلەی ورد، نائەبەدیی‌و بەردەوامنەبونی ڕێسا زانستیەکان‌و نامومکین بونی پێشبینی کردنی قەبارەو تەوژمی گەردیلەیەك لە ساتێکی دیاریکراودا، ئاشکرا بونی ئەوەی کە ئەتۆمێك بە تەنها بریتی نییە لەپرۆتۆن‌و نیوترۆن‌و ئەلەکترۆن. بەڵکو چەندین جۆرە دەنگ‌و درەو شانەوەشی تێدایە، دانپیانانی مرۆڤ بەزەمبونی ئاستی زانیاریەکانی لەزانستدا، سەر هەڵدانی تیۆر گەلی "قەیران" ، "کۆمپلێکستی"(٢) و گەلێك گومانی تر، هەموو ئەندێشەکانی رامکردن‌و دەستنیشانکردنی ناوەندی زانستەکانی بەتەواوی لەناوبرد. خودی قەیران، وەك سیستمێکی بان مێژویی پێناسە دەکرێت‌و کۆمپلێکستی، بەهۆی سیستمە ئالۆزەکانیەوە، کارلێکردنی زنجیرەیەك هۆکاری سەربەخۆ بۆ ناو یەکتری فەراهەمدەکات‌و جۆرێك لەڕێکخراوە سەرەتاییەکان دێنێتە ئاراوە. تێکڕای ئەم دۆزینەوانە لە ناوەندی زانستەکاندا مژدە بەخشی گۆڕانکاری بەربڵاون‌و مزگێنی پەیدابوونی راستیەکی نوێ‌و سورشتێکی "خۆ ڕێکخەر"مان دەداتێ کە دەتوانرێ وەك راستی یەکجارەکی لەقەڵەم بدرێت. کەوابوو، مرۆڤ توانای ناسینەوەو لێك جیا کردنەوەی ئیمەیج‌و راستەقینەی دۆڕاندووە. هەروەها بڕگەی سێهەمی پۆستمۆدێرنیزم بەندە بەوەی کەمرۆڤ لەبری راستی لەگەڵ "چونیەکسازی- **Simulation** "دا روبەڕوبۆتەوە. پۆستمۆدێرنیزم تەواوی جیهان وەك گەمەیەکی ڤیدیۆیی دەبینێت کەتیایدا هەموو مرۆڤێك، یەکێکە لەفیگەرەکانی ئەم گەمەیە. هەڵدەبەزێ‌و دادەبەزێ، لەسوچێکەوە بۆ سوچێکی تر رادەکات، لەزەوی‌و ئاسماندا شەڕدەکات‌و هەموو ژیانی، لەسەر بناغەی نمونەو نواندن‌و چونیەکسازیی‌و ئیمەیجەکانەوە بیناکراوە(٣)، هیچ کامیان پەیوەندی بەراستیەوە نیە. ژان بۆدریار هێرشی سەربازی ئەمریکا بۆسەر عێراق بەیەکێك لەدیاردەکانی پۆستمۆدێرنیزم دەزانێت‌و چەند ڕۆژ پێش دەستپێکردنی هێرشە کە لەدیمانەیەکدا بەڕاشکاوی ڕایگەیاند کەجەنگ هەرگیز ڕونادات‌و هەموو شتێك ساختەو دەستکردە. بۆدریار ڕای وابو کە ئەمە گەمەیەکی ڤیدیۆییە لەسەر شاشەی تە لەفزیۆنی جیهان. تەنانەت دوای ڕودانی جەنگەکەش هەر سور بوو لەسەر قسەی خۆی‌و دەیگوت: "شەڕی کەنداو ڕوینەداوە[٤]." لەبەر ئەوەی لەدیگای ئەودا ڕاستی بوونی نیە، ئەوا ئەم هەموو کوشتارو ماڵوێرانی‌و هەژ بەسەری‌و هەزاران دەردی بێدەرمانی تر تێکڕا ناڕاست‌و جۆرێکن لە نواندن ." Simulation".

بڕگەی چوارەمی پۆستمۆدێرنیزم بەندە لەسەر بێ مانایی. لەجیهانێکی بەتاڵ لەعەقڵ‌و حەقیقەت، واتە لەو شوێنەدا کە هیچ زانست‌و مەعریفە یەك جێی متمانەو پشت پێ بەستن نیەو تیایدا هیچ راستیەك بوونی نیەو بەتەنها زمان هەودایەکی باریکی پەیوەندیە لەگەڵ بووندا، ئەوا زۆر ئاسایی دەبێت ئەگەر ماناش بێ مانبێت. (ئۆمبەر تۆکوا) لەکتێبی "ئاونگی فۆکۆ"ی ساڵی ١٩٨٩دا ئەوەی دەرخست کەجیهان لەپیازێکی ساکار بەولاوە نیەو گەر توێبەتوێ لێکی بکەینەوە دواجار لە "هیچ" بەولاوە هیچی تر نامێنیتەوە. هەر ئەم لێکردنەوەیە، واتە شێوازناسی شیکردنەوەو لێکدانەوەی گوتارەکان، تەنگژە بۆ پۆستمۆدێرنیزم دروستدەکات. دەبێ هەموو شتێك لێکبرێتەوە کاتێکش کە لێکردنەوە کە بگاتە ئەنجام، ئەوا مرۆڤ لەگەڵ فەزایەکی بۆش‌و کەلێنێکی گەورەدا روبەڕوو دەبێتەوە. لەو بۆشاییەدا هیچ شتێك نابێت کەمرۆڤ بەرەو مانا ڕێنوێنی بکات‌و جیاوازیەکانی پیشانبدات. ئەم بڕگەی چوارەمە، کەم‌و زۆر لەگەڵ بڕگەی یەکەمدا یەکدەگرنەوە. کەئەویش نکۆڵیکردنە لەحەقیقەت، ئەوەی کەپۆستمۆدێرنیزم لەو بڕگەیدا جەختی لەسەر دەکاتەوە گوماناوی بوونە. واتە نابێ متمانە بەهیچ شتێك‌و هیچ کەسێك بکەین‌و دەبێ بەدودڵییەوە بۆ هەموو شتێك بڕوانین.

گومان ئەندێشی بڕگەی پێنجەی پۆستمۆدێرنیزمەو ئاشکرایە کە تیایدا هیچ تیۆرو بیرکردنەوەیەکی رەهاو هیچ ئەزمونێك بەهاو متمانەی نابێت. دەبێ لەهەموو شتێك بەگومان بین‌و نابێ بەتەواوی بڕوامان بەهیچ شتێك هەبێت.

وێرای ئەم پێنج بڕگەیە، بڕگەیەکی تریش هەیە کەماهیەتێکی ئیجابی تری هەیەو بەمەبەستی پێناسەکردنی یەکێك لەتایبەتمەندیەکانی پۆستمۆدێرنیزم سودی لێ وەردەگیردرێت. پۆستمۆدێرنیزم چاوی بڕیوەتە فرەجۆری‌و هەمەچەشنەیی. جەخت لەسەر فرەلایەنەیی کلتور، نەتەوە، ڕەگەز، حەقیقەت‌و تەنانەت عەقڵیش دەکاتەوەو ڕای وایە کەنابێ هیچ کام لەمانە بەزیاتر لەوانی دی بزاندرێت‌و دەبێ هەمویان بەشێوەیەکی یەکسان لێکبکرێنەوە. بەپێی ئەم تایبەتمەندیانەو بەگوێرەی ئەو بڕگانەی کە باسمانکردن، پۆستمۆدێرنیزم ئیدیعای ئەوەدەکات کەمژدە بەخشی دەستپێکردنی چەرخێکی نوێیە لەسەر گۆی زەویدا چەرخێك کە لەچاخی مۆدێرن پێشکەوتوتر دەبێت‌و کلاوڕۆژنەکانی جیهانێکی تر بەڕوی مرۆڤی ئەمڕۆدا دەکاتەوە.

پێشتر گوتمان کەوێڕای ئەم بڕگانە، ناسینی دەستەواژەکانی تری پۆستمۆدێرنیزمیش پێویستن، کە ڕەنگە ئەم پێویستیە تا ئێرەی باسەکە هەستی پێکرابێت‌و بەبابەتەکەوە دیار بێت، بەڵام لەوەش پێویستتر ئاشنابونە بەدەستەواژەکانی خودی مۆدێرنیزم.

## دەستەواژەکانی مۆدێرنیزم

**مۆدێرن:** رەچەڵەکی وشەی مۆدێرن دەگەڕێتەوە بۆ، **modo**ی لاتینی کۆن‌و **modernus**ی لاتینی نوێ. واتا "هەنوکە" کەبەمانای "ئەمڕۆی"و "هاوچەرخ"یش راڤەکراوە. وشەی مۆدێرن پێشینەیەکی دورودرێژی هەیەو، هەر لەم شێوە لاتینییەیدا یەکەمجار لەسەدەی پێنجەمی زایینیدا بۆ جیاکردنەوەی زەمەنی ڕۆمی‌و کافرەکان بەکاردەهێندرا، ئیتر لەوکاتەوە مانای بەجێهێشتنی کۆن‌و چونەناو نوێیی بەخۆوەگرت.

وسەی مۆدێرن بۆ نیشاندانی ئەو چلۆنایە تیەیەکە لەئارادایەو لەگەل ڕابردودا جیاوازە. بەپێی ئەم پێناسەیە، مرۆڤ لەدێرەوە بووە بەمۆدێرن. لەدەوروبەری سالی ١١١٢ی زایینیدا، کلێسای (سن دێنیس) بەشێوەیەك نوێکرایەوە کە تاکو ئەو سەردەمە نەبینرا بوو. نەکلاسیك بوونە ڕۆمی. ئەبۆت شوگر، کەنۆژەنکردنی ئەم بینایەی لەئەستۆدابوو، نەیدەزانی چ ناوێك بۆ ئەم شێوازە نوێیە هەڵبژێرێت، بەناچار، پەنای بردە بەر ئەم دەستەواژە یۆنانیە Opus mpdemm واتە (کاری مۆدێرن) لەبەر ئەوەی باوی ئەو سەردەمە بوو. لەڕاستیدا ئەم بینایە بو بەبنیاتنەری ڕێبازێکی بیناسازی کەپاشان ناونرا (گوتیك). مەبەست لەو ڕێبازەیە کەرێنیسانس هەستا بەدژایەتیکردنی، بەنا شیرینو کۆنی زانیو لەبری ئەو، کلاسیکی یۆنانی بە"ڕێبازی مۆدێرن" لەقەڵەمدا. لەسەدەی شانزەهەم بەدواوە وشەی مۆدێرن بۆ جیاکردنەوەی سەردەمە مێژوییەکان سودی لێوەرگیرا تاکو جیاوازیەکانی نێوان هاوچەرخو کۆن دیاریبکرێت. ئەندێشەی مۆدێرن بەردەوام پشتی بەچەمکە شیکاریو بەڵگەییەکان بەستوەو دژایەتی لەگەڵ جادوگەریو خورافەو گومانە بێ بنەماکاندا کردوە.

**مۆدێرنیتە:** واتا نوێبونەوەو تازەگەریی. زۆرێك لەخاوەن قەڵەمو مێژوو نوسان لەو بڕوایەدان کەمۆدێرنیتە لەگەڵ ڕێنسانسدا هاتۆتەکایەوە، بۆتەهۆی پێشکەوتنی ئابوریو بەڕێوەبەرێتی عەقلانیانە، مەسەلەی بەها لەحقیقەتو ئەخلاقیات لەقەڵەمرەوی تیۆرەکان جیا بۆوە کە بەبۆچونی (ڤێبرو سیمل)، دەرەنجامی ئەم پێشکەوتنانە، هاتنە ئارای دەوڵەتۆکەی سەرمایەداریو پیشەسازی بوو. بەڵام ئەم بۆچونە لەڕوانگەی مێژوییەوە گەلێك سنورداره چونکە زۆر بەر لەو سەردەمەو لەسەدەی دوانزەهەمدا، ژمارەیەکی زۆری خەڵك خۆیان بەمۆدێرن دەزانی. بەدژواری دەتوندرێ ئاماژە بەتەواوی ئەو هۆکارانە بکرێت کە لەدورستبونی مۆدێرنیتەدا دەستیان هەبوە بەڵام بێگومان سەفەرو دۆزینەوەکانی سەدەی پانزەهەمو چاکسازیە ئاینییەکانی سەدەی شانزەهەمو شۆڕشی زانستیو پیشەسازی سەدەی حەڤدەهەم ڕۆڵێکی گەورەیان لەگۆڕانی ئەندێشە مرۆییەکاندا گێڕاوە. هەروەها دەشتواندرێ بوترێ مۆدێرنیتە هاوکاتە لەگەڵ گۆڕانی تێگەیشتنەکانی مرۆڤ لەخودی خۆیو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئۆمانیزمی سەردەمی ڕێنسانس کە لەسەدەی حەڤدەدا دەرکەوت. لەسەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا تیڕوانینی مرۆڤ بۆ جیهانو ئەو بۆچونەی لەبارەی جیهانەوە هەیبوو گۆڕدراو جیهانێکی نوێ لەدایکبوو کەتیایدا زۆرێك لەشتەیەقینەکان، شوێنی خۆیان بەگومان سپارد. لەڕوانگەی فەلسەفیەوە، ئەو سەردەمە نوێیە لەسەر بناغەی ئەندێشەی "عەقڵ"ەوە بیناکرابو، هەربۆیە پێی دەگوترێ "چەرخی عەقلانیەت" سەدەی هەژدەهەمیش هاوکاتە لەگەڵ وشەی "ڕۆشنگەری"دا. لەم ڕووەوە، مۆدێرنیتە بەسەر دوو قۆناغی جیاوازدا دابەشدەکرێت:

١- مۆدێرنیتەی سەرەتایی کەبریتییە لەچەرخی ڕێنسانس تاکو سەرەتای شۆڕشی پیشەسازی.

٢- مۆدێرنیتەی دوای شۆڕشی پیشەسازی، کەمرۆڤی بەرەو "سیستەمی دووەم"و سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی پەلکێش کردو لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا گەیشتە لوتکە. یۆرگن هابرماس، مۆدێرنیتە بەپرۆژەیەکی نیوەچڵ دەزانێتو مۆدێرنیزمیش بەدیاردەیەکی بالادەست، وەلێ مردوو لەقەڵەمدەدات.

**مۆدێرنیزم:** بریتییە لەگۆڕانو نوێبونەوەی سەرجەم ڕەهەندە کلتوریو هونەریو کۆمەلایەتیەکانو، بەگشتی تێکڕای سومبولەکانی شارستانیەتی خۆرئاوا دەگرێتەوە. ئەم وشەیە زۆر ئاڵۆزە چونکە لەلایەك ئاماژە بەفەلسەفەو کلتوری قۆناغی مۆدێرن دەکاتو لەلایەکی ترەوە جڤاتەکانی مێژووی هونەر لە سەد سالی نێوان ١٨٥٠-١٩٥٠ دەگرێتەوە. یەکێك لەهۆکارەکانی تری ئەم ئاڵۆزیە ئەوەیەکە هەرکام لەسیستەمە ئەکادیمیەکان جەخت لەسەر یەکێك لەڕەهەندەکانی دەکاتەوەو بایەخی پێدەدات. مۆدێرنیزم دەسپێکێکی دیاریکراوی نیە. لەمۆسیقادا ڕۆژانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەرکەوتوە بەڵام لەئەدەبیاتدا بەو بەرهەمانە دەستپێدەکات کە لەدوو دەیەی سەرەتای سەدەی بیستەمدا نوسراون هەروەها لەهونەرە شێوەکاریەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ ١٨٥٠. مۆدێرنیزم لەسەرەتادا بەمەبەستی دژایەتیکردن لەگەڵ ڕێبازو سیستەمە کلاسیکیەکاندا هاتەکایەوەو جەختی لەسەر ئەزمونو دۆزینەوەی حەقیقەتی گەوهەری ئەودیوی ڕواڵەت دەکردەوە بەڵام هەندێ لەهونەرناسان دەسپێکی مۆدێرنیزم دەگێڕنەوە بۆ ئەوجڤاتانەی کە لەسالانی ١٨٩٠-١٩٠٠ سەریان هەڵدا. واتە هەمان ئەو سالانەی کەداهێنانو گەشەی تەکنەلۆژییان بەخۆیانەوە بینی. بەهەرحاڵ مۆدێرنیزم بەسەر مۆدێرنبونو مۆدێرنیتەدا دەڕوانێت. کاتێك شارل بۆدلەر لەسالی ١٨٦٣ "وێنەکێشی ژیانی مۆدێرن"ی نوسی. داوای لەوێنەکێشەکان کرد کە ئەزمونەکانی سەردەمی خۆیان بەوێنە تۆمار بکەن. دەتوانین تایبەتمەندیە گشتیەکانی مۆدێرنیزم بەمشێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە، خودهۆشیاریی ستاتیکیانەو ئاشکراکردنی نەشازیەکانو خستنەگومانو نەهیشتنی متمانە، سروشتی لەبران نەهاتونی ڕاستیو ڕەتکردنەوەی ئەندیشەی کەسایەتی تۆکمەو جەختکردنەوە لەسەر تیۆرەکانی فرۆید. مۆدێرنیزم کۆمەلیك وردە بزاڤیش لەخۆدەگریتو هەر لە ئەمپریشنو سومولیزمەوە بگرە تادەگاتە فوویزمو کوبیزمو سوریالیزم و... هەر هەمویان لەقالبی مۆدێرنیزمدا جەخت لەسەر تیۆرەکانی خۆیان دەکەنەوە. مۆدێرنیزم گەشەسەندنیکی یەکسانی نەبووەو لەهەر شوێنیکدا کەسەریهەڵداوە لەسەروبەندیکی تایبەتدا گەیشتۆتە لوتکە. بۆ نمونە، ئەلمانیا لەدەیەی ١٨٩٠داو، جاریکی تریش بەچەند سالیك بەر لەهەڵایسانی یەکەم جەنگی جیهانی، ڕوسیا لەسالانی پیش شۆرش، بەریتانیا لەدەوروبەری ١٩٠٨، لەئەمریکا ١٩١٢، بەتەنها لەفەرەنسا، مۆدێرنیزم ناگاتە لوتکەو زیاتر شیوەی پیدەشتیکی پانو بەرزی هەبووە، کە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٣٠ لەسەر ئەو پیدەشتە ماوەتەوە.

مۆدێرنێتەو مۆدێرنیزم زیاتر پێکەوە بەکاردەهێنرێن‌و هەندێجاریش لەگەڵ یەکتری جیگۆڕکێ دەکەن، بەڵام دەبێ لەوە بەئاگابین کە سەرەڕای تەواوی وێکچوونەکانیان، ڕێچکەو ڕێساکانی ئەم دوانە لەسنورە دیاریکراوەکاندا لێك جیادەبنەو مۆدێرنیزم نوێبونەوەی گۆڕانە لەبوارە هونەری‌و کلتوری‌و تەکنەلۆژیەکاندا لەکاتێکدا مۆدێرنیتە هەم باس لەتازەگەری‌و گۆڕان دەکات‌و هەم مانای تێگەیشتنی نوێ لەجیهان‌و زەمەن‌و بوون‌و مێژوو دەبەخشێت. بەواتایەکی تر مۆدێرنیزم دیوە رواڵەتیەکانی شارستانیەتی خۆرئاواو مۆدێرنیتەش ڕەگەزە فیکری‌و فەلسەفیەکانی ئەو شارستانیەتە لەخۆ دەگرێت.

**مۆدێرنیزەیشن:** ئەم دەستەواژەیە لەسەدەی هەژدەهەمدا بۆ وەسفکردنی بینا نوێکراوەکان بەکارهێنرا. ڤالپۆل، لەساڵی ١٧٤٨ لەنوێکردنەوەی بینایەکدا سودی لەم دەستەواژەیە وەرگرت پاشان لە ١٧٥٢دا، فیلدینگ باسی مۆدێرنیزەکردنی —زمان-ی کرد.[٥] بەڵام بەشێوەیەکی گشتی مۆدێرنیزەیشن مەبەست لەو گۆڕان‌و گەشەو پێشکەوتنانەیە کە لەکۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا لەئاکامی شۆڕشی پیشەسازی‌و بەمیکانیزەکردنەوە بەدەستدێت. پیشەسازییەکی بەمۆدێرنیزەکراو لەگەڵ پیشەسازییەکی مۆدێرندا جیاوازی زۆرە.

### ئاڤانتگارد — Avant- Gard:

ئەم دەستەواژەیە کەزیاتر لەبارەی مۆدێرنیزمەوە بەکاردەهێنرێت، ڕەگوڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەگەلی بواری سوپاو سەربازیی‌و ئاماژەیە بۆ ئەو "گاردە پێشڕەو"ەی لەگروپێکی کەم وەلێ چارەنوسساز پێکدێت. ئەم گروپە بەهۆی خۆخستنە مەترسی‌و فیداکارییەوە، ڕێگە بۆ پێشڕەویکردنی سوپا خۆشدەکەن. ئەم دەستەواژەیە لەساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمەوە لەهەناوو ڕێرەوی سیاسەتی کلتوریدا دەرکەوت‌و مەبەست وەسفکردنی ئەو بزاڤانە بوو کە هێرشکردنە سەر ڕێبازو تێڕوانینە باوەکان‌و پێودانگە بۆرژوازییەکان وەك بەڵێنی خۆیان دەهێنایە ئەژمار. تاکە لایەنی جیاوازی نێوان ئاڤانگاردو مۆدێرنیزم لەوەدایە کە ئاڤانگاردیزم زێتر وەك بزاڤێك سەیردەکرێت، بەڵام لەمۆدێرنیزمدا هونەرمەندو بەرهەمەکانی جێگەی سەرنجن.

یەکێك لەڕێگەکانی ئاشکراکردنی پەیوەندی نێوان مۆدێرن‌و مۆدێرنیتەو مۆدێرنیزم ئەوەیەکە مۆدێرنیزم بریتی‌یە لەشێوازێکی هونەری کە هەڵگری تایبەتمەندیەکانی سەردەمی مۆدێرنیتەیە. واتە سەردەمێك کەتیایدا ژیانی ئابوری کلتوری‌و کۆمەڵایەتی لەڕێگەی مۆدێرنیتەوە بەتەواوی گۆڕانی بەسەر داهاتوە. بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی کەهونەری مۆدێرنیستی پاکانە بۆ مۆدێرنیزم بکات، یاخود مەبەستەکانی مۆدێرنیزم دەربڕێت، بەڵکو بەو مانایە دێت کە بەدەگمەن دەتواندرێ لەدەرەوەی تێکست‌و ڕەوتی کۆمەڵگەی بەمۆدێرنیزەکراوی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەدەی بیستەمدا بۆ هونەری مۆدێرنیستی بگەڕێین.

بەرلەوەی بچینە سەر دەستەواژەکانی پۆستمۆدێرنیزم، پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە پۆستمۆدێرنیزم نەشێوازو ڕێبازە، نەکارامەیی‌و تەکنیك، بەڵکو ناوی جوڵانەوەیەکە لەکلتوری کاپیتالیستی پێشکەوتودا. ئیدیعای ئەوەدەکات کەقۆناغی مۆدێرنیتە کۆتایی هاتوەو ئێستا لە کلتورێکی هاوچەرخدا دەژین بەناوی پۆستمۆدێرنیزم کەتیایدا تەنانەت باس لەکۆتایی مێژوش دەکرێت. بەڵام کێشەی ئێمە لەگەڵ پۆستمۆدێرنیزمدا هەر لەم وشەی "پۆست"ەوە دەستپێدەکات. بەواتایەکی تر لە ناسنامەکەیەوە دەستپێدەکات کەمولکی پۆستمۆدێرنیزم نیە. "پۆست" لکاوە بە"مۆدێرن"ەوە واتە لکاوە بەهەمان ئەوشتەی کە پۆستمۆدێرنیزم نکۆڵی لێدەکات. مانای ئەم "پۆست"ە چییە؟ ئایا بەمانای پاش مۆدێرنیزمە؟ ئایا ئاکامی مۆدێرنیزمە؟ ئایا نیشانەی گەشەی مۆدێرنیزمە؟ ئایا ڕەتکردنەوەو حاشاکردنە لەمۆدێرنیزم. بەسەر سوڕمانەوە دەبینین کە پۆستمۆدێرنیزم لەتەواوی ئەم مانایانە بەهرەمەندەو هەموویانی قبوڵکردوە. پێشتر گوتمان مۆدێرن زادەی وشەیەکی لاتینی‌یە بەمانای "هەنوکە". ئایا بەلەبەرچاوگرتنی ئەم مانایە دەتوانین بڵێین پۆستمۆدێرن واتا "دوای هەنوکە"؟ یەکێك لەتەنگژەکانی پێناسەکردنی پۆستمۆدێرنیزم هەر لە راڤەی ئەم "هەنوکە"و "دوای هەنوکە"یەوە سەرچاوە دەگرێت. واتە قبوڵکرنی شتێکی بانتر لە هەنوکە، بەبۆچونی ژان فرانسوا لیۆتار، پۆستمۆدێرن لەڕووی زەمەنەوە، بەدوای مۆدێرن دا نایەت بەڵکو مۆدێرنیتە بەردەوام هەڵگری پۆستمۆدێرنی خۆیەتی. لیۆتار پۆستمۆدێرن بە بەشێکی جیانەبۆوە لەمۆدێرن دەزانێت‌و، رای وایە کەهەموو ڕێبازێك لەگەڵ ڕێبازەکانی پێش خۆیدا کەوتۆتە دژایەتی‌و ململانێ. ئەگەر ئەم بۆ چونە قبوڵبکەین، ئەوا ناچارین ئەوەش قبوڵبکەین کەخودی "مۆدێرن" ، "پۆست"ی شتێکی پێش خۆی بووە. مۆدێرن بەرە بەرە بەهۆی زات‌و ماهیەتی مۆدێرنبونەکەیەوە، هەستا بەدژایەتیکردنی ئایدیاکانی خۆی‌و بەناچار بوو بەپۆستمۆدێرن، چونکە ئەگەر وانە بوایە، ئەوا تا ملان لەقوردا دەچەقی‌و مۆدیرن‌و بزیو نەدەبوو. بەم پییە دیارەدەیەك دەتوانیت مۆدیرن بیت کەپیشتر، پۆستمۆدیرن بوبیت. کەوابوو پۆستمۆدیرنیزم، لەکۆتایی مۆدیرنیزمدا نییە بەلکو لەسەرەتای مۆدیرنیزمدایە، هەروەکچۆن پۆست ئەمپریشن لەسەرەتای مۆدیرنیزمدا بوو، نەك لەکۆتاییەکەیدا.

مەسەلەکە هیندەش ئاسان نیەو دەبێ بۆدۆزینەوەی وەڵام بەرەگ‌و ریشەی مۆدیرنیزمدا بچینەخواری‌و بەوردی پیایدا بگەڕیین‌و بزانین لەکۆیدا هونەری مۆدیرن شیوەی پۆستمۆدیرنی بەخۆیەوە گرت. بەڵام دیسان لەم گەرانەشدا لەگەڵ دەستەواژە گەلیکدا روبەرو دەبینەوە کە نائاشناییمان بەماناکانیان دەبیتە مایەی هەلوەدایی‌و سەرلیشیوان. هیندیك لەدەستەواژەکانی پۆستمۆدیرنیزم، بەپیچەوانەی مۆدیرنیزمەوە کەبەهەرحاڵ لەگەل هیندیك لەرەهەندەکانیدا ئاشناین، دەستەواژەگەلیکی تازەو نامۆو هەنوکەیین. بۆنمونە لەکتیبی "هونەری پۆستمۆدیرن"دا، کە (نایجل ویل) پیایدا چۆتەوە، ئەم رستەیە بەرچاو دەکەویت "بەمەبەستی خولقاندنی ئایرۆنی سود لەئاویتەگەری وەردەگریت بەڵام بەردەوام رەوت‌و شیوازەکەی لەئاراستەی قایلکردنی زەوق‌و سەلیقەی کیچ‌و

رەمەکیدا هەندیجار چاو دەبریتە کەمپەوە. رەنگە هەندی جار شیوەیەك لەشیوەکانی نواندن بەخۆیەوە بگریت بەلاّم زیاتر واقیع گەرایانەبە." ئەمە یەکیکە لەو رستانەی کەبۆ خوینەری ئاشنا بەم چەمکانە نوسراوەو هیچ چەشنە ئالۆزیەکی تیدانیەو دوای ئاشنابوون بەماناو دەستەواژەکانی بۆمان دەردەکەویت کەزۆر روون و ئاشکرا دەر بردراوە. بەلاّم بۆ خوینەری نائاشناو نامۆ بەم دەستەواژانە، شتیکی نامەفهومەو مانایەکی رونی نیەو هەر وەك لەسەرەتادا ئاماژەم پیدا هەر چەشنە گوتنەوەو گیرانەوەیەکی ئەم جۆرە رستانە، کارەسات بارەو نەهامەتی لی دەکەویتەوە. ئەم دەستەواژانە لەتەرجەمەکردن نایەن و دەبی ماناکانیان بزانین.

هیندیك لەدەستەواژەو ماناکانی پۆست مۆدیرنیزم لەوانە هیرمنوتیك (زانستی راڤەکاریی)، دال و مەدلول، ماناو... زیاتر لەبواری فەلسەفەدا بەکاردەهیندرین و بیگومان هونەرمەندانی ئیمەش لەمیانەی خویندنەوەی ئەو تیکستانەی لەبارەی پۆستمۆدیرنیزمەوە نوسران، یاخود تەرجەمەکراون زانیاریەکی ریژەییان سەبارەت بەم دەستەواژانە بەدەستهیناوە. هەر بۆیە لیرەدا تیشك دەخەینە سەر ئەو دەستەواژانەی کەلەگوتارەکانی هونەرە شیوەکاریەکاندا بەکار دەهیندرین، بۆ هەر کامیان نمونەیەك ئەهینینەوەو دواجار، ویرای تویژینەوە لەدەستەواژەی "دیکانستراکشن" لەریگەی نمونەیەك لەتیروانینی ئەمرۆیی و دیکانستراکتیڤیستیانەوە لەبەر هەمیکی هونەری بەناوبانگ دەکۆلینەوە.

**Discourse**: (گوتار) مانای ئارکۆلۆژیانەی ئەم وشەیە، توانا یاخود کردەی بیرکردنەوەی ریك و پیك و مەنتیقی و بەرەو پیشبردنی پەیڤینە لەریگەی بوژاندنەوەو دەولەمەند کردن و بەجیهیشتنی گوتاریکی مەنتیقی و خەریکبون بەگوتاریکی ترەوە. بەلاّم لەمانا زمانشوناسیەکەیدا بەواتای پەلهاویشتنی زمانە بەرەو شتیکی بانتر لەتیکست، کەتیایدا هاومانایی و بەدواییەکداهاتنی پیکهاتەی رستەکان لەبەرچاو دەگیردریت. لەبەرهەمگەلی پۆستمۆدیرنیستەکانی وەك میشیل فۆکۆ، بەتایبەت لەبەرهەمی "پەرنسیپی شتەکان"ی سالی ١٩٦٦دا، چەقخواردویی نەلەسەر تیکستەو نەلەسەر نوسەر، بەلکو ئەوەی سەرنجی دەدریتی، بوارو زەمینەیە. بوارەکانی وەك میژووی سروشتی و ئابووری و ریسا گەلیك کەهەستاون بەپۆلینکردن و ریوایەتکردنی ئەمانە لەهەمبوو قۆناغیکدا. فۆکۆ بەگوتەی خۆی، بە"هەلکولین"ی گۆرانکاریە سەرەکیەکانی ئەم ریسایانەوە خەریکبوەو ئەمەی ناوناوە "دیرین شوناسی روناکبیرانە". بەکورتی دەتوانین بلین مەبەست لە وشەی گوتار، خەریکبونیکی جیدی و سیستماتیکیانەیە بەچەمکیکی تایبەتەوە.

**Sublime** : (نمونەی بەرزی، بەرزو بەنرخ) ئەم ئەندیشەیە لەکۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەو لەساتەوەختیکدا سەریهەلدا کەمەسەلەی دۆزینەوەی یاسایەکی گشتی دەربارەی داهینانی هونەر خرایەلاوەو شیوازەکۆن و کلاسیکیەکان برەویان نەماو بەسەر چون. ئەدمۆندبیرگو بۆمگارتن و زیتریش ئەمانویل کانت، هەولیاندا شیوازیکی تازە بدۆزنەوە کەئەویش هەمان ئەو دیاردەیە کەپییدەگوتری ئیستاتیکا. ستاتیکا هاوشانی بەرزییە، واتە قبولکردنی هونەر بەبی رەچاوکردنی یاساو ریسایەکی تایبەت. بەکورتی دەتوانین بلین تەواوی هونەری رۆمانتیك پشتی بەم ئەندیشەیە بەستوە. لیۆتار لەپیناسەیەکی هونەری مۆدیرندا دەلیت: "لەجیهاندا شتگەلیك هەن کەشیاوی گرتن (لمس) و نواندن نین، شتگەلیکە دەتوانریت بیریان لیبکریتەوەو درك بکرین، بەلاّم ناتوانریت وینا بکرین؛ ئەرکی سەرەکی هونەری مۆدیرن، پیشاندانی ئەم شتانەیە". بۆ نمونە گەر بمانەوێ بیسنوری و ناکۆتا پیشانبدەین، ئەوا هەرگیز ناتوانین، ئەمە پراوپری مانای sublime—ەو، نواندن و دەربرینەکەشی تەنها لەریگەی شیوازە تەجریدیەکانەوە دەستەبەردەبیت. وینەکیشی روسی (کازیمیر مالەڤیچ)، یەکەم کەس بوو کە لە ١٩١٥ دا سەرنجیدایە "بەرزی لەنواندننەهاتو"و تاکە ریگەی دەربرینەکەشی بەوینەکردنی چوارگۆشەیەکی سپی لەسەر باکگراوندیکی سپی، دەربری. وینەکیشیکی تر کە لەم ریگەیەدا هەنگاوی نا، (پیت مۆندریان) بوو کەرەوتی گەشەو پیگەیشتنی درەختیك پیشاندەدات. واتا رەوتیك کەبەنواندنەوەی واقیعگەرایانە دەستپیدەکردو بەئەبستراکتیکی نایاب کۆتایی دەهات. ویرای ئەم دوو هونەرمەندە، زۆریك لەوینەکیشەکانی تریش لەهەولی ئەوەدا بون کە قەیرانیکی نواندنەوە چارەسەر بکەن و پییانوابوو کەنواندنی راستەقینە تەنها ئەوەدەمە دەستەبەردەبیت کە لەکاتی دەربرینی ئەوشتانەی شیاوی نواندن نین، تەواوی هیما راستەقینەکان نادیدە بگیرین کەئەمەش، خۆی بەشیوەی راستەقینەیەکی بەرزو بەنرخ دەردەکەویت. ئەم جۆرەقسانە بەشیاو لەقەلەم ئەدران بەلاّم ئیستا گەر بیت و هەر ئەم شتە ناوبنیین بان راستەقینە hyper reality ، ئەوا پیماندەلین ئەوە زمان و دروشمیکی پۆستمۆدیرنیستیانەیە.

**Parody**: (پیچەوانە، هەجوکردن و ئاشکراکردنی عەیب و عاری یەکدی، تانەو تەشەر لەیەکتریدان) ئەم وشەیە لەیۆنانی کلاسیکدا مانای "خویندنەوە لەپالّ کەسیکی تر"دا دەبەخشیت، واتە چیکردنی ریوایەتیکی تازە لەریوایەتیکی سەرەکی، بەمەرجیك لەروی دەلۆیییەوە نەچیتە قالبی لاسایی و کۆپیکردنەوە. بەلاّم لەسەدەی شانزەهەمەوە لەزمانی ئینگلیزدا، واتای لاساییکردنەوە لەشیوازو ریبازی بەرهەمیکی هونەری بەمەبەستی گالتەجاری و هەلخەلەتاندن بەهۆی زیدەرۆیی لەچلۆنایەتی و هەلبەستن و پیکەوەلکاندنی پارچەکانیشی بەخۆیەوە گرت. مانای کلاسیکی خولقاندنی پارۆدی (سهل و ممتنع)ەو سەلمان روشدی دەیویست بەهۆی "ئایەتە شەیتانیەکان"یەوە پارۆدیەك دروستبکات بەلاّم سەر کەوتوو نەبوو، بەرهەمەکەی بەئاشکرا شیوەی هەلخەلەتاندن و گالتەجاری بەخۆیەوەگرت[٦]. مەبەستی پۆستمۆدیرنیزم لەبەکارهینانی ئەم وشەیە، هەمان مانا کلاسیکیەکەیتی کەهەندیجار وەك hgbrid (دو رەگەو لیکدراو)یش ئاماژەی بۆ دەکریت. یەکیك لەتایبەتمەندیەکانی بەرهەمی دو رەگە ئەوەیەکە بەشیکی، یان ئەوەتا بەشەکەی تری رەتدەکاتەوە یان دەیخاتەبەر رەخنەو راو بۆچونی خۆیەوە. لەهونەری شیوەکاری و فۆتۆگرافدا، پارۆدی شیوەی "خویندنەوە لەپالّ وینەکانی تردا" بەخۆیەوە دەگریت و تیکست و

وینـە ناوێتـەی یـەکدیدەکات. نمونـەی بارۆدیـە فۆتۆگرافیـەکان، ئـەو وینانـەن کـە(بـاربرا کـروگ) دەیـانگریت. (سـندی شـرمـەن) یـەکیکی تـرە لەوینـــەگرە پۆستمۆدێرنیستەکان، سندی بەبی لەبەرچاوگرتنی تاکسالاریو کەسایەتیەکی جیگیر، لەوینەیەکەوە بۆ وینەیەکی دی ناسنامە گۆرکی دەکاتو بـەم شیوەیە بارۆدی دەسەلاتی ئیمەیج نمایشدەکات. بەهەرحاڵ، لەبەرئەوەی کەهیچ تیکستیك ناتوانیت چۆنیتی خویندرانەوەی خۆی کۆرنترۆل بکات، ئەوا رەنگە تیکستی پارۆدیش بکەویتە داوی دیاردەی نۆژەنکرنەوەی خۆیو فۆرمیکی تازەو نەخوازراو بەخۆیەوە بگریـت. بـەردەوام ئەمەیـەکیك لەئالۆزیـەکانی سـتایتکای دیریـن بووە. ئایا بەدلنیاییەوە دەتوانین بلیین کە"بازرگانی ڤینزیایی" شیکسپیر، شانۆنامەیەکی دژە سامیە یاخود رەخنە لەدژایەتیکردنی سامیەت دەگریت؟

**Eclectic: (التقاطی، ئاویتەگەر)** **Eclecticism**: (ئاویتەگـەریی)، پۆسـتمۆدینیزم لـەپیناو رۆحکـردن بەبـەر پـارۆدیدا، سـود لەشـیوەکانی ئاویتەگەری وەردەگریت. ئەم وشەیە بۆ یەکـەمجار لەکۆتاییـەکانی سـەردەمی کلاسـیكو بەمەبەسـتی پیناسـەکردنی ریبـازی هـەندی لەفەیلەسـوفەکانی یۆنـان هاتەکایەوە. ئەم فەیلەسوفانە رایانوابو زۆربەی ئەو ئەندیشانەی کەخۆیانی پیـوە خەریکدەکـەن هـی خۆیـان نیـەو پیکـهاتوە لەئایدیاگـەلیکی بەرجەسـتە کـە لەریبازەکانی ترەوە گولبژیرکراون. ئاویـتەگەری بەواتای گولبژیرو ئاویتەکردنی ئەندیشەو ریبـازو چەمکـەکان، لەتـەواوی فەرهەنگـەکاندا بـەدیدەکریت بـەلام هەندیجار شیوەیەکی بان هۆشیارانەو ئەنقەست بەخۆیەوە دەگریت. هاومانـای ئـەم وشـەیە لەهـەریمی ئـایینو ئەندیشـە ئایینـەکاندا-**syncreticism** - (تیکەلاوکردن)ە؛ واتا ئاویتەکردنی نەریتگەلی ناسازگارو دژبەیەك، لەچوارچیوەی ئەندیشەیەکی یەکانگیری ئایینیدا. لەسـەردەمی رینیسانسـدا ئاویتـەکردنی رەگەزەکانی مەسیحیەتو کلاسیك بازاری گەرم بوو، هەندیجاریش شیوەی ئەزمونگـەلیکی پرمەترسـی بەخۆیـەوە دەگـرت. لەبـەر هـەندی، ژمارەیـەکی زۆری ئەندیشەمەندانی ئەو سەردەمە ئەزمونگەلی خۆیان دەشاردەوەو کەمتر بەشیوەی ریوایەتی نوسراوی تۆماریاندەکرد. "شـاژنی پەریـەکان" نوسـینی (ئـەدمۆند سبینسەر)، ئاویتەگەرییەکی ئایینی حەماسییە. جان میلتۆنیش، بۆ لەتەنیشت یەکرۆنانی میتۆلۆیاژی کافرەکانو سـەرهەلدانی مەسـیحیەت لـە"بەهەشـتی ونبو"دا لەگەلّ گەلیك ئاستەنگیو دژاوارییدا روبەرو بۆوەو، دواجاریش هەراوزەنای ئەهلی دیانەتی خرۆشاند. دوایین شـانۆنامەکانی شیکسـپیر تیکـرا ئاویتـە گەرینو تەنانەت دەتوانین بلین هەندیکیان لە camp یش نزیکدەبنەوە. بەردەوام رەخنەی ئەوە لەپۆستمۆدیرنیزم دەگیردریت، کەهەم لەتـەلار سـازیو هونـەرە شیوەکاریەکانداو هـەم لەئـەدەبیاتو سینەماو فۆتۆگرافـدا بەشیوەیەکی بنـەرەتیو زیـدە رۆیانـە، ئاویتەگەرییانـەنو سـود لەهـەموو ریبـازو قوتابخانـەکان وەردەگریت. لەراستیدا ئاویتەگەریی شیوازیکی زۆر بڤەو مەترسیدارە، چونکە زۆر بەئاسانی دەبیتـە کیـچو تەنانـەت وریـنەش. بەلگەیـەك بـۆ سـەلماندنی ئـەو شتەی کەلەسەرەتادا وتمان، ئیمە لەسەردەمی پۆستمۆدیرنیزمدا دەژین، هەر ئەم ئاویتەگەریە لەژمارنەهاتوانەیە کەهەندی جار شیوەیەکی لاسارو بی ئامـانجو بی کەلك بەخۆیانەوە دەگرن. تەلەفزیۆن بیوچان پینەوپەرۆی بەرنامـە کۆنـەکان لیکگریدەداتـەوەو بەرنامەیـەکی کورتـی بـی مەبەسـتو بـی بـەهای لیهـەلدە بەستیت. دەنگی بیژەریك بۆ دەیان رۆلّو کەسیتی بەکاردینیت. یەك تاکە دەنگ، شەویك فەیلەسوفیکی شارەزایەو شـەویکی دی کریکـاریکی نـەخویندەوارە، شەویك میژوزانو هونەر ناسیکی کارامەیەو بەیانیەکەی ریکلام بۆچیپسو بوکەشوشەی منالاّن دەکات. بیژەری تەلـەفزیۆن شـەویك لەگـەلّ ئەندیشـەمەنداندا باسی مەسەلە فەلسەفیەکان دەکاتو بەیانیەکەی لەسەر رادیۆ دەستدەکات بـەبالۆرەلیدانو چـەند کـاتژمیریك دواتـر لاسـایی سـۆهرابی سـپیهری دەکاتـەوە. بەکورتی هیچ شتیك لەجیی خۆیدا نییە.

**Irony: (تەنز، خۆلەگیلیدانی سوقراتیانە)** هەردوو شـیوازی پـارۆدیو ئاویتەگـەریی سـود لـەئایرۆنی وەردەگـرن. ئـەوەشمان بیرنـەچی وشـەی تـەنز کـە لەبەرامبەر irony دا هاتووە، بەهیچ کلۆجیك واتای دەلۆییو هینانەپیکەنینو، ئەوەیکە ئەمرۆ دەیخەنـە پالیـەوە، ناگەیـەنیت. مانـای رەسـەنو یۆنـانی ئـەم وشەیە خۆگیلکردنە. سوقرات لەمیانەی گفتوگۆکانیدا، بەمەبەستی خستە دوای نەیارەکانی، خۆی لەگیلی دەدا، کەواتە تەنز تژییـە لەحیلەگـەرییو دەربرینـی شیتکە بەشیوەی تەوسو پلار؛ مەبەست تانە لیدانە. تەنز دیاردەیەکی هۆشیارانەیە لەپیناو گەیاندنی ماناو مەفهومیکدا بەکاردەبریت کە لەتیکسـتدا نیـەو بەروالەت دەرنەبردراوە، وەلی خوینەر یان بیستەر هەست بەبونی دەکات. نواندنە پۆستمۆدیرنیستیەکان زیاتر شیوەیەکی تەنزئامیزیان هەیە، چونکە لـەپیناو ئەوەیکە حەقیقەتەکانی دەرەوەی بەرهەمی هونەری بەشیوەیەکی متمانەدار نمایشبکەن، هیچ ریزیك لە (جیهانی راستەقینەیان ئەخلاقیات)، نـاگرن. تەنانـەت شـانۆنامە پۆسـتمۆدیرنەکانیش نکۆلـی لەهـەر چەشـنە مانایـەك دەکـەنو وەك مۆزیکایـەکی ڤیدیۆیـی کەرسـتیك ئیمـەیجی بیکـەلكو بـەبی ئـەوەی بـواری کاریگەردانانیان هەبیت، بەخیرایی بە بەرچاوی بینەردا تیپەردەکەن. شیوەیەکی جیدیترو لیبراوانەتری تیکسـتە پۆسـتمۆدیرنەکان، ئەوانـەن کـەدیدەی خوینـەر یان بیسەر لەسەر ئەوە رادینن کەسەربەست بیت لەهەلبژاردنی ماناو راڤەو تەفسیرەکانی. نمونەیەکی سەرەتایی ئـەم شـیوازە لـەنۆڤل "مـەعشـوقەی ئەفسـەری فەرەنسی" نوسینی جان فایلر (١٩٦٩)دا بـەدیدەکریت، کـەدو حالـەتی زۆر جیـاواز دەخاتـە بـەردەم بینـەرەوە. هـەروەها لەشیعری پۆستمۆدیرنیشدا جۆرە بەکارهینانیکی ئەزمونیانەی زمان بەدیدەکریت، کەرەگو ریشەکانی دەگەرینەوە بۆ ئەندیشەکانی (چارلز ئیڤلسۆن).

**Allegory: (تەمسیل، خوازە "استعارە"، پلار، نمونەهینانەوە)** ئەگەر ریوایەتیك بەداپۆشـراوی بخویندریتـەوە، بـەجۆریك کەمانایـەك یـاخود زیـاتر لەمانایەك لەخۆبگریت، ئەواپیی دەگوتری پلار، پلار پیناسەی شتیکە، لەژیر پـەردەی شـتیکی تـرداو لـەپیناو گەیشـتن بەمەبەستەسـەرەکیەکانی خـۆی سـود لەهیماگەلی جۆراوجۆر وەردەگریت. زۆریك لەبەشەکانی تەوراتی سەردەمی کۆن بەشیوەیەکی نەریتی وەك پلار دەخویندرانەوە حالەتی کتیبی سەردەمی نـویو

...ی هەبوو. بەم پێیە پلار، هەر لەدێرەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو قۆناغی رۆمانتیکەکان، یەکێك لەکاریگەرترین شێوازەکانی خوێندنەوەو نوسین بووە، باسان وەلانراوە. شێوازە هونەرییەکانی پۆستمۆدێرنیزم بەشێوەیەکی حاشا هەلنەگر وەك شێوازەکانی پلارە، چونکە بواری زاوزیی پارۆدی‌و ئایرۆنی لەرێگەی شێوازەکانی ئاوێتەگەرییەوە فەراهەمدەکات. پلار خۆیلەخۆیدا هەموو شتێك داگیردەکات، تەنانەت دەست بەسەر کەرەستەو مادەکانی خۆشیدا دەگرێت، شێوازێکە کەتیایدا، تێستەکان لەرێگەی یەکترەوە دەخوێندرێنەوە. پلار زیاتر مادەو کەرەستە لێکهەلوەشاو کەرت‌و پەرتەکان هەلدەبژێرێت. پلاری سەدەکانی ناوەراست‌و رینیسانس، زیاتر بەشێوەی پچر پچر بون. واتە بەشێوەیەکی ناریکوپێك‌و ناکامل بەشێکی بەرایوایەتیکی ترەوە زیاد دەکرد ئەویش بەبێ لەبەرچاوگرتنی بونیادێکی یەکانگیرو ئۆرگانیکیانەی ئەوبەر هەمەی کە لەدایکدەبوو. تایبەتمەندیتی پلار ئەوەیە کەئیمەیجەکان دەگۆرێت بۆ ماناگەلی شەفەوی‌و هەمان متمانەش دەبەخشێت بەوشەکان‌و بەم شێوەیە دولایەنەیی مانا، کەسیفەتی بەرهەمی پۆستمۆدێرنیزمە، نمایشدەکات. رەنگە پێویستبکات ئاماژە بەو خالەش بکەین کەسود وەرگرتن لەزمانی پلارو خوازە، تەنها دەتوانی ئەوشتە بینیتەوە یادی کەسی بەرامبەر، کەپێشتر ئاشنایی لەگەلدا هەبوبێت یان فێری بوبێت.

**Schlock: (بێنرخ، هەرزان، گەندە)** ئەم وشەیە پێکهاتەیەکە لە زمانی عیبری‌و ئەلمانی‌و لەو گوتەزایەوە هاتوە کە لەنیوان جولەکەکانی روساو پۆلۆنیاو ئەلمانیادا برەوی هەیە. ئەم وشەیە بۆ وەسفکردنی ئەو شمەکە ناپەسەندو بێنرخانە سودی لیوەردەگیردرێت کەخەلکی رەشۆکی دەیکرن‌و وەك دیاری پێشکەشی یەکدی دەکەن. لەوانەش وەك ئەو بۆکەلانەی کە بەئاوینەیان بەجامی دواوەی ئۆتۆمبیلەوە هەلیدەواسن. ئەو پشیلانەی کە لەبۆرەك دروستدەکرین‌و سەریان لەگەلّ جولانی ئۆتۆمبیلەکەدا دەجولێتەوە، یاخود ئەو سەگانەی چاویان لەدوگلۆپی بچوك دروستکراوەو لەکاتی ئیستۆپکردنی ئۆتۆمبیلەکەدا، پیدەبن‌و ئەوجۆرە شتانەی کە نەدەتوانین وەك یاری منالان‌و نەشێتکی جدی لەقەلەمیانبدەین. یاخود ئەو پەیکەرانەی لەشێوەی بوکەشوشە دان‌و رەنگدەکرین، یان ئەو ماکیتە بچوك‌و ناقۆلاو بەدقەوارانەی کەلەبەر بیناو تەلارە بەناوبانگەکانەوە دروستدەکرین.

**Kitsch: (ناپەسەند وەلی مەبەستدارو بەواتا)** دوابەدوای شۆرشی پیشەسازی ئەوروپاو پەیدابونی کارو سەرهەلدانی کارخانەکان، ئەو خەلکانەی لەلادیوە بەمەبەستی پەیداکردنی بژیوییەکی زیاتر رویانکردە شارەکان‌و کۆمەلیك گروپی کریکاریی‌و پسپۆریان پیکهینا. گروپە تەکنیکی‌و کارگیرییە پیشەسازیەکان دروستبون‌و شانبەشانی ئەوانیش، لەگەلّ پەلهاویشتنی هەمەلایەنەی شارەکاندا، فرۆشگاگەلیکی بیئەژمار دامەزران‌و چینی کاسبکارو مام ناوەندیش گەشەی کرد. تائەو دەم تەنها کەسانی تایبەت دەیانتوانی خویندەواربن بەلام لەو ساتەوەختە بەدواوە خویندەواریی بوو بەشتێکی پێویست‌و هەموو کریکارو کاسبکاریك لانیکەم لەپیناو بەئاگابوون لەیاساکانی کارکردن، پێویستی بەخویندنەوەو نوسین هەبوو. بەم شێوەیە خەلکیکی زۆر فێری خویندەواریی بون. وەرزیریك کە لەلادیدا دەژیا، دەبوایە هەر لەگەلّ دەرکەوتنی کازیوەی بەیاندا لەکیلگە دەستبەکاربێت‌و کاتی خۆر ئاوابون بەشەکەتی گەرابایەوە بۆ مالەوە، تا پاروە نانیك بخوات‌و بنوێت‌و سەرلەنوی خۆی بۆکاری سبەینی ئامادەبکاتەوە. بەلام ژیانی شارو کارکردن لەکاتژمێرە دیاریکراوەکانی کارخانەدا، مانای بەدیاردەیەك بەخشی بەناوی کاتی پشودان. کاتەکانی دوای کاری رۆژانەو رۆژانی پشودانیش هاتنەکایەوەو دەبوایە بەجۆریك لەجۆرەکان ئەم کاتە بەتالانەش پربکرینەوە. کریکاران‌و چینی مامناوەند بۆ پرکردنەوەی کاتەبەتالەکانیان پێویستیان بەسەرگەرمیەك هەبوو بۆ کات بەسەربردن، ئەوەشی کە سەرگەرمی دەکردن شانۆناکەکانی شێکسپیرو کۆمیدیای ئیلاهەی دانتی‌و مۆزیکای باخ‌و تیکستە فەلسەفیەکانی کانت‌و دیکارت نەبون. بەلکو ئەوان عەودالی شتێك بون کەسەرگەرمیان بکات‌و بەسانایی بۆیان قوتبچێت. هینانەدی ئەم نیازو خواستە، خۆیلەخۆیدا بووە کارو کاسبی کۆمەلەخەلکیکی تر هەر بۆیە بەرەبەرە دیاردەو سەلیقەیەك بەناوی _کیچ _ەوە سەریهەلدا.

کیچ لەدەستەواژەی . - verkitschen–ەوە وەرگیراوە. کە لەدەوروبەری سالی ١٨٧٠ لە"مونیخ" کەوتبۆە سەر زاران‌و مانای "پارەپەیداکردن"ی هەبوو. کیچ هونەریکی دامالراوە لە بەهائیستاتیکیەکان‌و بەتەنها چاوی بریوەتە ئاسان پەسەندی خەلکی سادەخوازو ساکار ئەندیش. شتێکی بێ مەترسیەو ریبەرایەتی سەلیقەی خەلکی رەشۆکی دەکات‌و بەهیچ شێوەیەك خۆدەرخەرانە نیەو هەندی جار نیشانەی نیازپاکی‌و لەخۆبوردوییەو دواجار جەڤەنگیکی سانتی مانتالیانەیە. بەلام کیچ بەواتای زبلّ‌و زالّ‌و ناپەسەند دیت‌و بەمەبەست‌و ئاراستەیەکی تایبەتەوە، پیناسەی زەوق‌و سەلیقەیەك دەکات کەهەم خراپەو هەم خۆدەرخەرانەیەو بریتیە لەکۆی ئەوشتانەی کە دەستکردو سواون.[٧] ئەم وشەیە لەنیوەی دەیەی ١٩٣٠دا بەواتای سەلیقەی خراپ هاتە ناوزمانی ئینگلیزیەوە، کلیمینت گرینبیرگ (١٩٣٩) یەکەمین رەخنەگربو کەبەشێوەیەکی بەربلاوو رەخنەگرانە بۆ پیناسەکردنی (ئانتی تیز)ی بەها ئیستاتیکیەکانی مۆدێرنیزم، سودی لەم وشەیە وەرگرت.[٨]

کیچ جۆرە هەستیکی درۆزن‌و قەلبە، کەبەهەموو ئاوازیك دەکەویتە سەماکردن، بی بەهایەو هەر بەبی بەهاییش دەمینیتەوە. بەپیی گوتەی گرینبیرگ، کیچ کورتکراوەی تەواوی ئەوشتانەیە کە لەژیانی ئیمەدا دەستکاریکراون. یەکێك لەمەترسیەکانی کیچ ئەوەیە کەسنورەکانی لەگەلّ هونەری بەرزو بەنرخدا، گەلیك تەمتومان‌و نادیارن‌و بەئاسانی دەتوانیت خۆی بخاتە شوینی هونەرەوە.[٩] پۆستەری دیمەنی بزەیەك کیچە وەلی پۆستەری مونالیزا کیچ نیە بەلام کاتیك هەر ئەم پۆستەرەی مونالیزا، لەسەر تیشیرت‌و تەنەکەی خۆلّ چاپبکریت ئەوا کیچەو وەك پیناسەی سەلیقەی کیچ لەقەلەمدەدریت. بورجی ئیڤلّ کیچ

یە، بەدەم کەیریك کەکۆڵەکەکانی لەشیوەی ئەوبورجە دروستبکرین، کیچــە. میـلان کۆندیـرا دەڵیـت: "دوو دلـۆپ فرمیسـك بـەدوای یـەکدا لـەچاو هـەڵدە جوڕن، دلۆپی یەکەم دەڵیت، دیمەنی راکردنی منالان لەنیو میرگو سەوزەگیادا چەند جوانە. دلۆپی دووەم دەڵیت: چەند جواندەبـوو ئەگـەر دیمـەنی راکردنـی منالان لەنیو گژوگیادا تەواوی خەلکی جیهانی بزواندبا؛ ئەوە دلۆپی دوەمەکە کیچ دەکات بەکیچ".

یەکیکی تر لەتایبەتمەندیەکانی کیچ ئەوەیەکە زیاتر لەهــەموو شـتیك لەدەوروبـەری خۆمـاندا دەیبـنـینو هـەندی جـار بەرهەمهینانەکەشـی کۆڵـەدراویکی تیدەچیت. ئەدەبیاتو بلاوکراوەکانمان زیاتر کیچن نەك جدی. دەتواندری زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنی سیو سی بەشی لەفیلمیکی نیـو کـاتژمیریدا بگونجیندریت. هەروەها چەندین خولەکی کاتی رادیۆ کەهەر چرکەیەکی لەسەر حسـابی گیرفـانی خـەلك پارەیـەکی ئەسـتوری تیدەچیـت، تایبـەتدەکریت بەپرسـیارو وڵامـی دووکەس کە ئاخۆ ئەتوانیت مەتەلەکە هەلبینیت، کەسیش پرسیار ناکات کە ئایا ئەم قسە پوچانە چ سودیك بەبیسـەران دەگەیـەنیت؟ مـەترسـی هەرەگـەورەی سەلیقەی کیچ لەوەدایە کەخەلك لەسەر شتی پوچو ناپەسەندی شیوە روناکبیرانە، رادینیت.

**Camp**: (؟) لەجیهاندا زۆردیارە هەن کەناویان بۆ دیارینەکراوەو زۆریك لەوشتانەش کەبیناون، بەدروستی پیناسەنەکراون. یەکیك لـەم شـتانە ئـەو هەستەوەریە مۆدیرنو ئالۆزو لەپیناسە نەهاتوەیە کەپیی دەگوتری کەمپ. کـەمپ یەکیکـە لـەهیماکانی تـاك. خۆشویسـتنی شـتی ناسروشـتیو دەسـتکردو زیدەڕۆیانەیـە. ئـەو هەسـتەوەریەیە کەهەمووشـتیکی جـدی دەگوریـت بۆشـتی دەسـتکرد. کـەمپ حالـەتیکی تایبـەتی تیروانینـە بـۆ جیـهان لەروانگەیـەکی ستاتیکیەوە بەلام نەك لەریگەی جوانیەکی باوەوە بەلکو لـەروی پلەبـەندیو ستیلیزەیشـتنەوە، بینینـی جیهانـە لەریگـەی جوانـیو شـیوازیکی زیدەڕۆیانـەوە. کەمپ ستاتیکایەکی تایبەتە لەوجۆرەی کەسوزان سوتناگ پـەیرەویدەکات. سـوزان سـوتناگ لـە"گفتوگـۆ"دا دەنوسـیت:"دەبـی دلـت وەکـو بـەردبیت تـاکو بتوانیت رووداوی مـەرگی نیل بچکۆڵ بخوینیتەوەو پیبکەنیت". کەمپ شیوازی تیروانینە بۆ ژیانو شتەکانی دەوروبەرو دۆزینەوەی چلۆنایەتیەکانە لـەمرۆڤو شمەکەکاندا، بەم پییە هەم هونەری کەمپو هەم سەلیقەی کەمپ بونی هەیە.

تیۆریستەکانی کەمپ رایان وایە ئەم وشەیە بـۆ پیناسـەکردنی کلتـورو سـەلیقەی ئـەو گروپـە پـەروایزیو وردە کلتورۆکانەیـە کەحەقیقـەتی سەرسـنوریو پەراویزیانەی خۆیان ناشارنەوە. هەرچەند ئەم وشەیە هەندی جار دەربارەی هیمیۆ سیکشوالەکانیش بەکاردەهیندریت، بەلام مانایەکی بەربلاوتری هەیەو رەنگە لەلایـەن زۆریـك لەگروپـەکانی تـری وەك ئـەو روناکبیرانـەی کـە لەپیگـەی چینایـەتی خۆیـــان دابـــراون، واتـــە روناکبـــیرە خۆدەرخـــەرەکان یـــاخود کەمینـــە نەتەوەییەکانیشەوە بەکاربهیندریت. کەواتە کەمپ زادەی زمـانیکی تاکەکەسیو تایبەتە کـە گروپیـك وەك ناسـنامەیەکی هاوبـەشو بەمەبەسـتی بـەرگریکردن لەخۆیان لەبەرامبەر هیزە دەرەکیەکاندا سودی لیوەردەگـرن.[١٠] ئـەو دەمـەی دیاردەیـەك بـەناوی (پـانك) لەئـەوروپا سـەریهەلدا، پانکـەکان سـەلیقەیەکی تایبەتیان لەناوخۆیاندا برەو پیدا کەئەویش camp بوو. هەر لەجلو بەرگ پۆشینو شـیوازی ئایشـتکردنەوە بگـرە تـا دەگاتـە ئـەو کتیـبو بلاوکراوانـەی کـە لەلایەن ئەوانەوە یاخود بۆ ئەوان لەچاپدەدرا، تیکرا پیناسەی سەلیقەی کەمپ بوون. دەتوانین بلیین، کەمپ جۆرە بروایەکی لاسارو لەخۆباییانـەو هـەندی جـار شەرانگیزانەی گروپچیتیە. . ریز لەسەلیقەیەك دەگرنو چیژ لەشتگەلیك وەردەگرن کەرەنگە لەلایەن دابو نەریتی خەلکانی ترەوە سەرسـور هینـەر بیـت یـان بەسوكو قیزەون لەقەلەمبدریت. بەواتایەکی تر، سەلیقەیەك کە لەلایەن تاقمو گروپیکەوە بەشیوەیەکی وردبینانەو ئاگایانە کرابیتە شتیکی شیوە روناکبیرانـە ئەوا camp– ە نمونەی دیاری هونەری کەمپ لەهیلکارییەکانی "ئوبری بردزلی"و تابلۆکانی "گوستاو کلیمینت"و "دەریاچەی قوو"ی "چایکۆ فسکی"و دەرهینانەکانی "سالومە ڤیسکۆنتی"وە، شۆردەبیتەوە تا دەگاتە تابلۆکانی "منریستی پۆنترمۆ"و "کـاراواجۆ"و روناکیـە شـانۆ ئاسـاکانی "ژۆرژ دلاتـۆر". توخمی سەرەکی کەمپ جدی بونە بەلام جیـدی بونیـك کـەدواجار شکسـتی هینـابیت. هەلبـەت ئەمـە بەومانایـە نیەکـە هـەموو ئەوشـتەجیدیانەی بەشکسـت کۆتاییانهاتبیت بەکەمپ بینە ئەژمار، بەلکو مەبەست ئەو جیدیبونەیە کەتیایدا ئاویتەیەك لەزیدەرۆییو خەیالپلاو و جۆش فرۆشیش بەدیبکریت.

Semiotics: هیماگەری یاخود ماناشوناسی، بریتییە لەزانستی هیماو ئەو سیستەمـەی کە لەریگەیەوە فۆرمیك دەبیتە خاوەنی بایەخو مانا. ئامرازیکـە بۆ بەرقەرار کردنی پەیوەندی لەنیوان گروپە مرۆییەکاندا. دەتواندریٚ زمـان،حالەت، جولە، خۆراك، پۆشاك، مۆزیکاو.... تەنانەت وەرینی سـەگیش وەك هیمـا لەقەلەمبدرین. فردینان ساسـۆر کەیەکیکـە لەدامەزرینـەرانی هیماگـەری پییوایـە کـەزمان بەتـەواوی ماناکانیشـیەوە، زادەی رسـتیکی کـورتو بچوکـە لـە phonemes(وشە). وشە بچوکترین یەکەی سیستەمی دەنگە کەدەتوانیت واتا گەلی جۆراو جۆرو تەنانەت دژبەیەکیش بخولقینیـت. ساسـۆر وەك بونیـادیك لەزمانی دەروانیو دەیگوت وشە چ بەشیوەی دەنـگو چ بەشـیوەی هیمایـەکی سـەرکاغەز، بریتیـە لـە -signifier- (دال). ئەمـە خـۆی لـەخۆیدا هـەلگری چەمكو ئەندیشەیە کەبەناوی -signified- (مەدولول). کۆی ئەم دوانە، یەك هیما دەخولقینن. ساسۆر پییوابوکەکلتور بەتـەواوەتی لـەهیماکان دروسـتبوەو سـوری ژیـان لـەگرەوی ئـالوویرکردنی ئـەو فۆرمانەدایـە کـە دابو نەریتـەکان مانایـان پیبەخشـیوە. ساســۆر دەیگـوت هەموویەکەیـەك لـەزماندا، هـەم لەپیناسـەکردنی یەکەکانی تردا رۆلی هەیەو هەم لەریگەی هەندی لەیەکەکانی ترەوە پیناسە دەکریت. ئەمـە ئەو تیۆریـە بـو کەبناغـەو کۆلەکـەی بونیادگـەری دامەزراند پاشان پەلیهاویشتە نیو سۆسیۆلۆژیاو کۆمەلناسیو هونەرو زۆریك لەهونەرەکانی تریش. چـارلز سـندرز پـیرس کەیـەکیکی تـرە لەدامەزرینـەرانی

زانستی هیماگەری ویرای قبولکردنی دالو مەدلول دەیگوت  هەموو هیماکان، ئاماژە بەو چاوگانە دەکەن کە لەخودی هیما گرنگترن. هەر هیمایەك ئاماژەیەکە بۆشتیکی دەرەوەی خۆی کەبەهاکەی لەگرەوی راڤەو تەفسیری ئەو چاوگانەدایە. هونەرە شیوەکاریەکان لەگەڵ ئەم چەشنە لەبران نەهاتوەی هیماکەریدا، روبەروبونەتەوە.

ساسۆرو پیرس لەگەڵ تەواوی جیاوازی بیرو بۆچونەکانیشیاندا، وەك یەکانگیریەك بۆ هیمایان دەروانی بەڵام ژاك دریدا، یەکیکە لەدامەزرینەرانی ئەو فەلسەفە نوییەی ناونرا پۆست بونیادگەری. لەو بروایەدا بوکە پەیوەندی نیوان دالو مەدلول زۆر لەمە فراوانترە لەم پەیوەندیە دا هیچ نزیکایەتیەکی یەك لەدوای یەکیان نیە. دال بەمەدولول کۆتایی نایەتو بەتەنها دەتوانین لەدالیکەوە بگەین بەدالیکی تر. هەر دالیك سەرەداویکە بۆ گەیشتن بەسەر داوەکانی دی. بونیادگەری تیکستیکی بەکاملو تەواو دەبینی، بەلام پۆست بونیادگەری، جەختی لەسەر خویندنەوەی فەردانیەتی تیکست دەکردەوە نکۆلی لەکاملو تەواو بونی تیکست دەکردو بروای بەهیچ جۆرە یەکانگیریو نەگۆرییەکی مانا نەبوو، بەلکو تیکستی هەلدەوەشاندەوە ماناکانی لەکۆتو بەند رزگار دەکرد. هەر چەندە نەیدەگوت هەموو شتیك بی مانایە بەلام هیچ مانایەکیشی بەکاملو یەکجارەکی نەدەزانی. دواجار هەر ئەم تیۆرە دیکانستراکشنی لیکەوتەوە.

**Structuralism** (بونیاد باوەری، تیروانینی بونیادیانە، بونیادگەری)، post-  structuralism(دوای بونیادگەری): لەچەمکی زامانەوانیدا بونیادگەری گەرانیکی شیتەلکارو شیکاریانەو دۆزینەوەی ریسا گەلیك کەبتواندریت لەریگەیانەوە بەسودوەرگرتن لەگوتەزاکانی بونیادو سیستەمەکەیەوە، تایبەتمەندیەکانی زمانیك وەسفو پیناسەبکرین. بناغەو کۆلەکەکانی بونیادگەری بەنوسینەکانی مارسل مائۆسو باختینو پۆنتیو هەندی لەو بیرمەندانەی کە بەیەکەمین بونیادگەرا ناسراون، دامەزریندرا. ئەم گروپە روی خۆیان لەو پیناسەیە وەرگیرا کە وجودییەکان لەبارەی کۆمەلگە دابویان بەدەستەوەو رویانکردە بناغەی ئەبستمۆلۆژیای زانستو وەك سیستمیك لەکۆمەلگە وردبونەوە. لەروانگەی ئەوانەوە چیدی، میژوی زانستەکان زمانی ئەندیشە نەبوو، بەلکو چیکردنی فۆرمیکی ئەبستمۆلۆژیانەوە، چوارچیوەیەکی رۆشنبیرانەی دیاریکراوی پیکدینا. ویرای ئەمەش، ئەزمونگەلی تازە لەبارەی کۆمەلگەو تاكو چونەژیر کاریگەری نوسینەکانی فرۆید، بونەمایەی گۆرانی واتای رابوردو. چیدی رابوردو لەریگەی ماناو راڤەکانی رابردووەوە درك نەدەکرا، بەلکو لەریگەی تیفکرینو قولبونەوە لەچەمکە هاوچەرخەکانەوە دەخرایە بەر تویژینەوە. بونیادگەری زیتر شیوازو ریبازە نەك چواچیوەوپرەنسیبیکی دیاریکراو هەر بۆیە دەتوانیت لەرەهەندە جۆراوجۆرەکاندا کارایی هەبیت.

دەتوانین بلین بونیادگەری شیوازناسیەك بوو کە لەپیناو بەدەستەوەدانی یاسایەکی گشتی لەکۆمەلگەیەکی دیاریکراوو لەچوارچیوەی بونیادیکی سەربەخۆدا، مامەلەو چالاکیە مرۆییەکانی وەك (زمانو سیستەمی خزمایەتی) دەخستەبەر تویژینەوە. کەچی هیندەی نەبرد کەبیرۆکەی بونیادیکی سەربەخۆ، دژەی کردەنیۆ چەمکە مۆدیرنیستیو ریساجۆراوجۆرە هونەرییەکانیشەوە کە لەسەرەتای دەهەی ١٩٧٠ تا کۆتایی دەهەی ١٩٨٠ خۆی وەك یەکیك لەگوتارە فەلسەفیو کلتوریەکان دەرخست. لەدەهەی ١٩٧٠دا، تەنانەت هەندی لەتەلار سازەکانیش بەمەبستی شیکاریو جویکردنەوەی تەلار سازی، سودیان لەشیوازناسیو تیۆرەکانی کلۆد لیڤی شتراوس وەرگرت. بونیادگەری زنجیرەیەك ئایدیالۆژیای فۆرمالیستیانەشی لەهەناوی خۆیدا پەروەردەکرد. ئەم شەپۆلە بەربلاوەی ئایدیەلۆژیاکان خوازیاری ئەوە بوون کە بەتەنها خۆیان بەزمانەوە نەبەستنەوەو پانتایی زمانناسی لەشمەكو هەلسوکەوتەکانی مرۆڤیشدا پەرەپیبدەن.[11] هەر بۆیە بەچاوی سیستەمیك کە لەکۆمەلە هیمایەك پیکهاتبیت، بۆ هەموو شتیکیان دەروانی. بەواتایەکی تر، بونیادگەرەکان متمانەیەکی ئەوتۆیان بەئاماژە دەرو چاوگەکانی جیهانی راستەقینە نەبوو ئەوەیکە لەدیدگای ئەوانەوە بەگرنگ دەزانرا، ئەو شتەبوو کەچاوگەکانی دەنواندەوە. ئەم هیمایە لەدال (وتە، رەنگ، ئیمەیج)و مەدلول (چەمك، مانا) پیکدەهاتو لەبونیادیك یاخود تیکستیکی (چیرۆك، وینە، شیعر) کە لەپیکهاتەیەکی هیمایانەی ناسراودا چیکرابوو، لەتەك هیماکانی تردا رۆدەنیشت. پیشتر (فردینانت ساسۆر) ئەو تیۆرەی بنیاتنا بوو کەلەزمانەوانیدا بەتەنها ناولینانو جیاوازیەکان بەدیدەکرینو پەیوەندی نیوان دالو مەدلول هەروەها پەیوەندی نیوان هەر هیمایەكو ئاماژە دەرەکەی تیکرا هەوەنتەو بیئا کامبوە چونکە متمانەکەی لەلایەن دابو نەریتە کلتوریەکانەووە دیاریدەکریت.

وشەی بونیادگەریی، لەدەیەی ١٩٧٠دا کەمتاکورتیك بەکۆمەکی (رۆمان یاکوبسۆن)، لەگەڵ مانا شوناسیو هیما گەریدا ئاویتەبوون کەدواجار نەك هەر بووە هۆی جیابونەوەی (بونیادو تیکست)لە ئاماژەدەرەکەیان، بەلکو جیابونەوەی بونیاد لەتیکست واتا جیاکردنەوە لەنوسەرو هونەرمەندیشی لیکەوتەوە. تەواوی هەولدانی بونیادگەری لەسەر ئەوەقەتیس ببوکە بونیادی گشتی چالاکیە مرۆییەکان بخاتە پەراویزەوەو لەزمانناسیدا بەدوای هاوماناکانیدا بگەریت.

بەڵام پۆست بونیادگەری هەروەك لەناوەکەیەوە دیارە، بەرەتکردنەوەو نکۆلیکردن لەشیاویتی سەر بەخۆیی سیستەم دەستپیکردو هەستا بەدژایەتیکردنی ئەو ریسایانەی کەبریار بوو سیستەم لەچوارچیوەی ئەواندا بەریوەبچیت. لەقەلەمرەوی زماندا تیشکی خستەسەر لاوازی بونیادەکانی زمانو لەو بروایەدابوو کەکورتکردنەوەی زمان بۆ ئالۆیرکردنی پەیامو پیکهینانی پەیوەندی یاخود گۆرینەوەی زانیاریەکان، جۆرە بیرکردنەوەیکی ساویلکانەیە. سەرەتا ژاك دریداش

بەدەری یاسایەکی گشتی خستە گومانەوە. پاشان گوتاری گرژی نیوان هزرو بابەت، کەئەگەری هەر جۆرە پیناسەیەکی بابەتیانەی پیوەبەندە، هینایە گۆرێو دواجار مەسەلەی بونیاد واتە "گرژی دولایەنە"ی خستە روو.

بونیادگەریی‌و پۆست بونیادگەریی لەسی لاوە کۆمەکی سەر هەلدانی پۆستمۆدیرنیزمیانکرد:

١- گوتیان لەپیناو ریکخستن‌و تەنانەت چیکردنی راستەقینەشدا سود لەزمان وەردەگیردریت. واتە زمان ئەو توانستە ئەدات بەمرۆڤ کەمانای پیبە جیهان ببەخشیت. شیوازی نواندنەوە، تەنانەت راستەقینە یاخود ئەو ریوایەتەش دەگریتەوە کە لەراستەقینەوە بەرهەمدیت‌و دواجار رۆلی سەرەکی لەئەستۆی زماندایە. ئەم پیناسەیە نەك هەر لەوە دیهاتنی پۆستمۆدیرنیزمدا رۆلی هەبوو، بگرە یەکیك لەبنەما تیۆرییەکانی پۆستمۆدیرنیزمیشی پیکهینا.

٢- مانا تەنها لەریگەی پەیوەندی بەبونیادەوە دیتەدی، واتا هەموو شتیك بی مانا دەبیت ئەگەر پەیوەندی بەشتەکانی ترەوە نەبیت.

٣- هەردوکیان پییانوابوو کەزمانی زارەکیانەو زمانی نوسین ئاشکراترین‌و راشکاوترین نمایشی بونیادو چلۆنایەتی پەیوەندیدارە بەماناوە. هەربۆیە خویندنەوەی شیوازی کارایی زمان، لەپەیبردن بەوەی کە چۆن بەرهەمە کلتوریەکان دەتوانن خولقینەری مانابن، رۆلیکی گەورەی گیراوە. پاشان کاریگەری ئەم ئەندیشانە وای لە(تریئیگلتۆن) کرد کە لە١٩٨٣دا، بنوسیت: "سەرەرای ئەمانەش، زمان بەهەموو رازو نیهنی‌و شتە شاردراوەکانیەوە، هەم نمونە هینەرەوەو هەم دلەراوکیی ژیانی روناکبیرانەی سەدەی بیستەمە".

لەسی سالی رابردودا بونیادگەرو پۆست بونیادگەرەکان‌و فەیلەسوفانی وەك لیڤی شتراوس، لاکان، دریدا، فۆکۆ، دلۆزو لیۆتار لەبەرزکردنەوەی ئاستی تیگەیشتنە مرۆییەکاندا رۆلیکی ئیجگار بنەرەتی‌و سود بەخشیان گیراوەو بەرهەرمگەلی بەپیزو بەهاداریان خولقاندوە. هەرچەندە بونیاد گەرو پۆست بونیاد گەرەکان زۆر لەیەکتر جیاوازن بۆ نمونە پۆست بونیادگەری سود لە"زمانناسی بونیادیانە" وەرناگریت بەلام ویچکونگەلیك لەنیوانیاندا بەدی دەکریت‌و هەردوکیان روانگەیەکی رەخنەییان هەیە. رووی یەکەمین رەخنەشیان لەسۆبجیکت، گەوهەرو زاتی مرۆییە. وشەی "زات" ئاماژەیە بۆشیکی تەواو جیاواز لە"تاکەکەس". وشەی "تاك" کە لەقۆناغی رینسانسدا لەدایکبوو لەسەدەی حەڤدەو هەژدەدا شیوەو فۆرمی پیگەیشتوی خۆی بەدەستهینا، تیبینی ئەوە دەکات کەمرۆڤ بونەوەریکی هەستەوەرو ئازادەو دەستکەوتە ئەندیشەییەکان، لەژیر گوشارو ستەمکاریی‌و هەل‌و مەرجی میژوویی‌و کلتووریدا، نەگۆردراون بۆنمونە "من"ی دیکارت کەبیردەکاتەوە، نەك هەر بونەوەریکی هۆشیارو سیستەمیکی سەربەخۆیە، بگرە یەکانگیریشە. لەسەردەمانی رینسانسدا، مرۆڤ ناوەندی جیهان بوو بەلام لیڤی شتراوس کەیەکیکە لەپیشەنگەکانی ریبازی بونیادگەری، گەوهەری مرۆیی بەناوەندی بوون لەقەلەمداو وای بۆدەچو کەدوایین ئامانجی سۆسیۆلۆژیا ئەوەنیە کەمرۆڤ بەرپا بکات‌و رەسمیەتی پیببەخشیت بەلکو خوازیاری ئەوەیە کەمرۆڤ مەحال بکات. هەر ئەو تیۆریەی شتراوس دواجار هاتەوە سەرشیوەی دروشمی بونیادگەرەکان.

بونیادگەریی‌و پۆست بونیاد گەری هەردوکیان رەخنە ئاراستەی میژوگەرایی دەکەن‌و بەشیوازی هەمەچەشنە بەندبونی میژوو بەپرۆسەیەکی گشتیەوە بەشتیکی سلبی دەزانن. نمونەی دیاری ئەم تیۆرە رەخنەییە، ئەو هیرشەیە کەلیڤی شتراوس دەیکاتە سەر تیۆری ماتریالیزمی میژووی سارتەرو دژایەتی لەگەل ئەو بۆچون‌و گریمانەیەی سارتەردادەکات کەدلی کۆمەلگەی ئەمرۆ لەکلتورەکانی پیشوو باشترە.[١٢]

**simulation : (چونیەکسازی) Simulacrum (چونیەککراو):** دەبی لەگفتوگۆکانی ئەفلاتوندا بەدوای رەگو ریشەکانی ئەم دەستەواژە لاتینیەدا بگەرین کەتاماوەیەك لەمەوبەریش لەدەقە ئینگلیزیەکاندا بەphantasm یاخود Semblance تەرجەمەدەکرا هەروەها لەدەقە فەلسەفیە فارسیەکانیشدا، بۆ یەکەمیان (صورخیال، صورت وهمی، خیال)و بۆ دوەمیان (ضاهر، نما، نمود) دادەنرا. ئەفلاتون ئەم واتایەی بۆ جیاکردنەوەی "عەقلانیەت" لە"هەست"، "ئەندیشە" لە"ئیمەیج" و"گەوهەروزات" لە "روالەت"، بەکاردەهینا. ئەفلاتون وینەکیشەکانی بەخولقینەری وەهم‌و خەیال دەزانی‌و پییوابوو کەئەم گروپە ئاگایان لەراستەقینە نیەو هیندەلییان دردۆنگبو دەیگوت دەبی لەگەل هونەرمەندەکانی تردا لەکۆمار وەدەرنرین. هەلبەت لەریگەی وردبونەوە لەوتەکانی ئەفلاتون‌و قوتابیەکەی واتا ئەرەستۆوە، دەتوانین لەوەتیبگەین کەمەبەست زیاتر شاعیرو تراژیدیانوس‌و ئەکتەرانی تراژیدیا بووە. بەهەرحال چونیەکسازی واتا لیکچونی درۆزن، هونەرە شیوەکاریەکان لانیکەم لەسەردەمی ئەفلاتونەوە دەستەویەخەی پەیوەندی نیوان راستەقینەو لاسایی‌و کۆپی بووە. لەجیهانیکی بەکارهیندا کەتیایدا بیوچان کالاو شمەکەکان بەرهەمدەهیندرین‌و چونیەکسازیدەکرین، دیاردەی بەدەلسازیش، بەردەوام رەوت‌و تەوژمی خۆی دەبیت‌و بەجۆریك پەرەدەگریت کەئیتر جیاکردنەوەی رەسەن لەقەلب‌و بەدەل دەبیتە شتیکی مەحال. ئەمرۆ لەسایەی سەری تەکنەلۆجیای پیشکەوتوودا، دەتوانین، قۆناغەکانی رابردوو، ئیمەیجەکان، شمەك، دەروبەرو تەنانەت خۆشمان کۆپی‌و چونیەکسازی بکەین. ئیستا جۆرە پەتایەکی دەرونی بلاوبۆتەوەو پییدەگوتری نەخۆشی پۆستمۆدیرنیزم کەتاکو ئەمرۆ جیهان شتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە. نەخۆشانی ئەم جۆرە بیماریە پییان وایە کەخزم‌و دۆست‌و ئاشناکانیان لەگەل ئەلتەر ناتیڤگەلی چونیەکسازیکراودا گۆردراون. ڤایرۆسی ئەم پەتایە بەدەستی ژان بۆ دریار کەتیۆرمەندی ئەم خەیالپلاوانەیە بەجیهاندا بلاوکراوەتەوە. جیهانیك کەتیایدا راستەقینە، لەراستەقینە شۆراوەو هیندە تەشەنەیسەندوە کەجیاکردنەوەی دروست‌و نادروستی مەحالکردوە.

هەموو جونیەکسازیکراویك شوینی شتی رەسەنی گرتۆتــەوەو تەنـها لەبـەر ئەوەیەکـە ئـەم دوانـە لیکجیـا ناکرینـەوە سـەرجەم متمانـە کـردن بەرەسـەنایەتیو بەهاوبانی سـەکان تیکدەرمیتو ئەوەشی کە سەرچۆپی دەگریتو هەلهەلەی شادی لیدەدات کالای قەلبو نارەسەنە.[١٣] تاماوەیەك لەمەوبەر، دەتوانـرا وینـە یاخود کاسیتیکی دەنگ وەك بەلگەیەکی جیی متماتەو باوەرپیکراو لەدادگادا بخریتەروو بەلام ئـەمرۆ تەنانـەت فلیـمو کاسـیتی ڤیدیـۆش، چونکـە گومـانی چونیەکیازی لیدەکریت، دادگا پەسەندی ناکات. تۆم هینکس، لەفلیمی "فارست گامپ"دا، سیو چەندسالڵ دوای کوژرانی جۆن کەنەدی، دەستی دەگوشیتو گفتوگۆی لەگەلدا دەکات.

**Cybernetics** : لەزمانی فارسیدا هەم "فرمانیك"و هەم "خودبردار" یان داناوە.[١٤] واتـا "خۆگـەر" سـیبرنتیك ئـەو گوتارەیـە کـە لەدەوروبـەری سالی ١٩٤٢ سەریهەلداو لـە١٩٤٧دا، (نۆربـیرت ڤینـەر)ی ماتمـاتیکزانو (ئـارتۆرۆ رۆز نبلـوس) زانـای بەرجەسـتەی فیزیـا، ئـەم ناوەیـان لینـا. مەبەسـت لەسیبرنتیك ناسینی جیاوازیە بنەرەتیەکانی نیوان فیزیاو ماتماتیکەو وەکو زانسـتی کۆنـترۆلو پـەیوەندی ماشـینو ئاژەلـەکان، پیناسـەدەکرا، ئـەم پیناسـەیە بریتی بوو لە ١- کۆنـترۆلکردنی پەیوەندیە نزیکـەکان بـەرەوتی زانیاریەکانـەوە. ٢- یاسـا چاودیرەکـانی کۆنـترۆلکردن، گشـتیو جیـهانگیرنو پشـتیان بـە دولایەنەییو جیاوازیە کلاسیکەکانی نیوان سیستمە ئۆرگـانیكو نـا ئۆرگانیـەکان، نەبەسـتوە. ئـەم وشـەیە بـەرە بـەرە دزە یکردۆتـە نـاو بـوارە زانسـیتەکانی تریشەوەو ئیستا وشەگەلی وەك سیبرنتیکی ئەندازیاری، سیبرنتیکی دەرون شیکاری (کە بەکارکردی میشکی مرۆڤەوە خەریکدەبیت)، سـیبرنتیکی سـتاتیکی (کە بە bionicsیش ناو دەبریت)، سیبرنتیکی کۆمپیوتەرو کارگیریو... کەوتۆتە سەرزاران.

**Multicultural: (فرەکلتوری) intercultaral: (نیوانکلتوری)**

**Transcultural : (گوازراوە)** هەرکاتیكو لەهەر کوییەکدا، زیاتر لەیەك کلتـور روبـەروی یـەکدی ببنـەوە، جـاچ بەتـەباییو چ بەناخۆشـی، ئـەوا سنوریکی هاوبەشی تژی لەئەزمونیش پیکدیت. بەگشتی بەرهەمی ئەم بەریەککەوتنە ناونراوە "فـرە کلتـووری" کـە لەراسـتیدا بربـرەی پشـتی ئەزمونگـەلی کلتوریکی هاوچەرخە. کۆچ، تاراوگە و دروخستەوە، پەنابەریتی، ئاسانبونی سەفەرکردن بۆ ولاتانی تر، رەوکردنو نیشـتەجیبون، سـەیرکردنی فلیـمو هـەوالو سەتەلایت هتد.. ئەمانە سەرجەم هۆکاری ئاویتەبوونی کلتورەکانن. ئەم راستیەش، پیویستی بەرستیك وشـەو نـاو و پیناسـەو راڤـەو پۆلینکردنـی تـازە هەیـە هەروەك "گیلرمۆگومزپەنا" دەلیت : "کاتی ئەوە هاتوە کەسەرلەنویّ بەشیوازی خۆمان جیهان پاکبکەینەوە". ئـەمرۆ دیـالۆگی نیـوان کلتورەکـان شـتیکی پیویستو حاشا هەلنەگرەو دەشزانین کەرەنگە ئەم دیالۆگە ببیتە هۆی پچرانی زنجیرەکانو بەربونی هاوکـاتی جنـدو فریشـتەکان وەلـی ناچـارین کـە لـەپیناو تیمارکردنی هەموو برینیکدا، یەکەمجار سەری برینەکە بکەینەوە. گفتوگۆ لەگـەل "ئـەوانی دی"دا هـەم ئـەزمونیکی سەرنجراکیشـەو هـەم بـەئازارو ترسـناکە، شتیکە لەشیوەی بزربوون لەناو لیرە واری چری بەدحالیبونو گوزەرکرن بەنیو مەیدانی بەمین چیندراودا، ئەمرۆ هونەری هەموو زیـدو سـەر زەمینـەکان بـووە بەبیرەوەریەکی هاوبەشی مرۆیی. هونەرمەندی ئەمرۆ رۆلیکی فرە رەهەندی لەئەستۆدایەو چیدی بەتەنها وینـەکیشو پەرەموچ وەشینیکی لیوەشاوە نیە، بەلکو مامۆستاو بیرمـەندیکی کۆمـەلایەتیو پاریزەری مافە مرۆییەکانیشە کە لەهەناوی کۆمـەلگـەدا دەسـتبەکاربوە نـەك لـە گۆشـەو پـەراویزە پسـپۆریەکەی دەبـیّ بەرهەمەکەشی بەشیکی دانەبراوبیت لە ژیانە فرەرەهەندەکەی، چونکە ئاڤانگاردەکانی ئەمرۆ بەپیچەوانەی ئاڤانگاردەکانی سـەردەمی مۆدیرنـیزم، نـەك هـەر لەچەندین مـەیدانی نەبەرددا دەجەنگن بگرە لەهیلی پیشەوەی بەرەی جەنگەکە شدانو دەبی سنورەکان بشـکینن‌و وەك جـەنگاوەریك دزەبکەنـە نـاو هـەردولای بـەرەی جەنگەکـە. دەبیّ لەلایـەك لـەناو تیکسـتە هونەریـەکانو لەلایـەکی تـرەوە لـەناو تیکسـتە ناهونەریـەکاندا ئامـادەبن. واتـا دەبـی لەتـەواوی جیـهاندا دەستبەکاربن نەك بەتەنها لەجیهانی هونەردا.

یەکیك لەبەرهەمـەکانی ئاویتەبونی کلتورەکان، هونەری "دورەگە"یە، هونەری دورەگـە، هـەم دەتوانیـت لەهونـەری کلتـورو نەتـەوە جۆربـەجۆرەکانو هـەم لەهونەرە ناچوینەکەکانی کلتوریك پیکبیت. بۆ نمونە، بەرهەمەکانی (جۆن کیج)، ئاویتەیەکن لەمۆزیکاو شانۆو ئۆپیرا کەلەفەزای سیبرنتیکدا نمایشدەکرین.

**Deconstruction**: دیکانستراکشن لەزمانی فارسـیدا بـە(سـاخت شـکنی، دیگرسـازی، شالودەشـکنی، ضـد ساختـار، سـاختار شـکنیو...) تەرجەمەکراوە، بەلام پیدەچیت دروستترین هاوواتا فارسیەکەی ئەم وشەیە (واسازی- بنیاتنانەوە) بیـت.[١٥] "واسـازی" بـەواتای (بازسـازی - نۆژەنکردنـەوە) نایەت، بەلکو مـانای "دوبارە سازی" واتا "سەرلەنوی دروستکردنەوە" دەگەیەنیت؛ هەروەکچۆن "وابینی" "بازبینی" نیە بەلکو بینینی سەرلەنوییە.

حافیز دەفەرمویت :

**غمناک نباید بود از طعن حسود ای دل    شاید کەچو وابینی خیر تو در این باشد**

**واتە: خەمبار مەبە لەتانەی حەسود ئەی دلّ    رەنگە خیری تۆ لەوەدا بیـت کەسەرلەنویّ ببینیت**

تیۆرمەندی سەرەکی دیکانستراکشن، ژاك دریدا بەتاقی تەنیا، شـەری دیکانشتراکشـنی لـەدژی ئەندیشـەی عـەقلانی رۆژاوادا هەلایسـاندو، لەمبارەیـەوە چەندین بابەتو نامیلکەی نوسی.[١٦] دریدا پییوابوو کە ئەندیشەکانی خۆرئاوا بەردەوام لەژیر رکیفی "میتافیزیای حزور"دا بوون ئیستا کاتی ئـەوە هـاتووە

ژێرداریان بیت. بۆ پەیبردن بەم تیۆریەی دریدا، پیویستە سەرەتا بەچەمکی "Sousrature" ئاشنابین. مانای ئەم چەمکە بریتیە لەنوسینی وشەیەك، خەت بەسەراهێنانی پاشان بەبێ ئەوەی سرابیتەوە بەهەمان شیوەی خەت بەسەراهاتو چاپکردنی. واتا بەهۆی ئەوەیکە ئەم وشەیە بەتەواوەتی مەبەستی نوسەری نەپێکاوە یاخو گونجاوو پر بەپیستی خۆی نەبووە، ئەوا خەتی بەسەردا هیندراوە بەلاّم چونکە بەپیویست دەزاندریت دەبی بەجۆریك بیت کەشیاوی خویندرانەوەبیت، واتە نەسردریتەوە. ئەمە شیوازی مارتین هایدگەر بوو کەزیاتر خەتی بەسەر وشەکاندا دینا وەلی نەیدە سرینەوەو بەهەمان شیوە لەدەقەکەدا دەیهیشتنەوە چونکە لەگەلّ ئەوەشدا کەنالەبارو نەگونجاو بوون، بەپیویستیشی دەزانین. هەر وشەیەك لەزماندا هیمایەکە. ساسۆر وەك یەکانگیریەك لەهیمای دەروانی بەلاّم لەروانگەی دریدا دا، دالو مەدلول، بەشیوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندییان بەیەکترەوە نیەو هەرگیز وشەو ئەندیشە چونیەك نینو پیکەوە نایەنەوە. هیما جۆریك لە"هەم هەیەو هەم نیە"ی تیدایە. دالو مەدلول بەردەوام لیکجیا دەبنەوەو جاریکیتر بەشیوەیەکی دی یەکدەگرنەوە. دالو مەدلول وەك ئەمدیوو ئەودیوی پەرە کاغەزیکن، کەبەردەوام جیگۆرکی دەکەنو دواجار ناتوانین بگەین بەمەدلولیك کەخۆی دال نەبیت. واتە کاتیك هیمایەك دەخوینینەوە، دەستبەجی ماناکەی ئاشکرا نابیت. هیما باس لەشتیکی نادیاریشدەکات، کەواتە، بەردەوام بەشیك لەواتا بەنادیاریی دەمینیتەوە.[١٧] ماناکان بەردەوام لەدریژەی رستیك لەدالو مەدلولدا ریدەکەن، هەربۆیە ئیمە ناتوانین بەوردی تیشك بخەینە سەر شوینی دیاریکراوی ماناکان، چونکە هەرگیز بەهیمایەکی تایبەتەوە نابەسترینەوەو جیگیرو وەستاو نین. بەم پییە، مانا هەرگیز بەیەکسانی نامینیتەوەو لەدەقیکەوە بۆ دەقیکی تر دەگۆردریت. هەر ئەم گۆردرانو جیاوازییە، خوازە (استعارە) دروستدەکاتو بەمشیوەیە خوازە یاخود پلار دەتوانیت ناوی ئەو شتەبیت کە لەریگەیەوە مانا جیگۆرکی دەکات.[١٨]

لەراستیدا دیکانستراکشن جۆرە وینەگرتنیکە لەتیکست بەهۆی تیشکی ئیکسەوە. وەك ئەو شیوازەیە کەئەمرۆ بەمەبەستی دلنیابوونەوە لەرەسەنیو نارەسەنی تابلۆکان سودی لیوەردەگیردریتو لەریگەی تیشکی ئیکسو تیشکی خوار سورەوە سەرجەم تویژەکانی ژیرەوەی تابلۆکە دەردەکەوتنو هەندیجار وینەو هیلکاریەکانیش لەژیر تویژالی سەرەوەی تابلۆکەدا دەبیندرین. بەواتایەکی تر دایکانستراکشن شیوازیکە بۆ دەرخستنی ئەو جیاوازیانەی کەلەلایەك دەکەونە نیوان مەبەستو نیوەرۆكو لەلایەکی تریشەوە دەکەونە نیوان خویندنەوەو نیوەرۆکەوە. مەبەست چونەناوەوەی تویژالە روکەشەکەیە لەپیناو گەیشتن بەسەرچاوە شاردراوەکانی ئەندیشەو دەرخستنی ئەو تویژالاّنەی ژیرەوە کەگوایە لەتیکستیکدا بەروالەت نادیارنو فۆرمی یەکجارەکی خۆیان وەرگرتوە. یەکیك لەشیوازە هەرە دیارەکانی دیکانستراکشن ئەوەیەکە نەك هەر بەرهەمە هونەریەکان، بەلکو شیوازی بیرکردنەوەو تیگەیشتنەکانی بینەرو خوینەریش دیکانستراکتیڤو تەنانەت هەندیجار ویرانیشدەکات. کەسیك کە بەم شیوازە ئاشنابیت، ئەوا چیدی ناتوانیت بەشیوەیەکی باو لەتابلۆیەکی هونەری بروانیت، یاخود گوێ لەگوتاریك بگریت یان تیکستیك بخوینیتەوە. بۆ نمونە ئەگەر وتەبیژیك دەقی لیدوانەکەی بکات بەسی بەش، ئەوجا ئەو بیسەرەی کەبیر لەشیوازە دیکانستراکتیڤیستیەکان دەکاتەوە، بەردەوام دەکەویتە ئەو گومانەوە کەرەنگە بەشی یەکەم، بەشیکی دانەبراو لەبەشی سیهەم بیتو رەنگە بەشی یەکەمو دووەم جیگۆرکییانکردبیت. هەربۆیە هەندیجار جۆریك خویندنەوەی هەلەی بەئەنقەستو کەمتەرخەمیو بیبەلینی دەخەنەئەستۆی دیکانستراکشنەوە.

## تیروانینو هەلسەنگاندنی دیکانستراکتیڤیستیانە :

بۆئەوەی نمونەیەك لەخویندنەوەی تیکست (بینینی بەرهەمی هونەری) بەشیوازی دیکانستراکتیڤیستیانە لەهونەرە شیوەکاریەکان بدەین بەدەستەوە ، ئەوا لەمیانەی دریژەی باسو لیکۆلینەوەکەماندا تیشك دەخەینە سەر یەکیك لەبەرهەمە هونەریەکانی (یان ڤرمیر)، ناودارترین وینەکیشی قۆناغی ئالتونی هۆلەندای سەدەی حەڤدەهەم، هۆی هەلبژاردنی ئەم بەرهەمە بەناوبانگە ئەوەیەکە رەنگە خوینەر ئەم تابلۆیەی بینیبیتو پیی ئاشنابیتو بەسانایی بتوانیت پەی بەجیاوازیەکانی نیوان تیروانینی نویو تیروانینەکەی جاران ببات. لیرەدا پیویستە ئاماژە بەو خالە شبدەین کەخویندنەوەی دیکانستراکشنیانە لەلایەك بەهۆی ئەو سروشتەی کەهەیەتیو لەلایەکی ترەوە بەهۆی ئەو مانایانەی کە لەتویژە نادیارو کاکی بەکاکیەکانی ژیرەوەرا سەرەتاتکی دەکەنو خۆیان دەهاویژنە ناو هزرەوە، هەندیجار لەگەلّ خۆیدا ناکۆکەو رەنگە شتیك کەپیشتر بەهەزاران مەنتیقو بروبیانو سەپاندویتی، رەتبکاتەوەو بەرەو لایەکی تر بیبات.

"ژنو تەرازو" بەرهەمی (یان ڤرمیر)، وینەی ژنیکە جلوبەرگی شینی لەبەردایەو تەرازوویەکی بەدەستەوەیەو تابلۆی "رۆژی حەشر"، واتە هەمان ئەو بابەتەی کەزۆریك لەوینەکیشەکان بۆ نمونە (میکلانژ) سەرنجیان داوەتی، بەدیواری پشت ژنکەوە هەلوسراوە. روناکی لەپەرنجەرەی لای چەپەوە رژاوەتە ناو ژورەکەوەو دیمەنیکی خالی لەحیکایەتو ریوایەت دەخاتە بەرچاو. ژنان لەبەرهەمەکانی تری ڤرمیردا، نامە دەخویننەوە، ئامیریکی مۆزیکی دەژەنن، لەخشلّو ئالتونەکانیان دەروانن، لەگەلّ کەسیکی تردا دەئاخڤنو، بەگشتی وەك بەشیك لەریوایەتیك دینەبەرچاو، بەلاّم لەم تابلۆیەدا ژن بەرەو خۆی کیشکراوەو گوایە سەیری ناخی خۆیدەکات. هەردوو تای تەرازووەکە بەتالن، وەلی ئەمەش خۆی جۆرە هەلسەنگاندنیکە، رەنگە دروستیو وردبینی تەرازووەکە تاقیبکاتەوە. هەر ئەم کردەی هەلسەنگاندنە، لەپالّ تابلۆی "رۆژی حەشر"دا، کەئەویش باس لەجۆرە هەلسەنگاندنیك دەکات، ریوایەتی تابلۆکە لەئەستۆ دەگریت. روناکی لەروبەری ئەم تابلۆیەدا تەمتومانو بیسنورە، ئاماژە دەکات، جەختدەکاتەوە، نیگای بینەر لە بەشیکەوە بۆ بەشیکی ترو دواجار بۆ ئەو بەشەکیشدەکات کەجیی سەرنجی وینەکیش بووە. ئەم پەخشاندنی روناکیە یەکیك لەچەمکەکانی دیکانستراکشنی دریداییانە پیکدینیت، بەلاّم بۆ دەبی

هونەرە سیوەكاریەكان ملكەچی ئەو یاسایانە بن كەزمان دەیسەپینیت بەسەریاندا؟ بۆ دەبی هەلی ئەوە بە روناكی ڤرمیر نـەدریـت كـەخۆی بیتـەگۆو بایـەخی خۆی ئاشكرابكات؟ ولآمی ئەم پرسیارانە ئەوەیەكە بەدریژایی میژوو ئەم بـوارە دراوە بەبەرهەمـە هونەرییـەكانو بینـەریش دەرفـەتی وردبونـەوەی تـەواوی بـۆ شیكردنەوەی بزاڤە هزرییەكانی خۆی سەبارەت بـە بەرهەمـە هونەریـەكان هـەبووە، بـەلآم تیـ كـرای ئەمانـە بـەهۆی لیكدانـەوەی تاكەكەسـیو رەچاونـەكردنی تیۆرگەلی شیاو، بی ئاكام ماونەتەوە.

ئەو سی برگەیەی كەدیانستراكشن خۆی پی تەیار كردونو لەریگەی ئەوانەوە بەكژ میژوو رەسەنایەتیە دیرینەكاندا دەچیت، بریتین لە: تیـ كهەلكیشـبوونی تیكست، فرەمانایيو گومان لەپیگەی پراوپری مانا. واتە ریك هەمان ئەو ریسایانەی كەمیژوی هونەر لەلیكدانـەوەكانیدا هـەرگیز خـودی ئـەوانی لەبـەرچاو نەگرتووەو لای لینەكردونەتەوە.

## تیکهەلکیشبونی تیکست:

گوتارگەلی چلۆنایەتیە هەنوكەییەكانی بینینی تیكسـت، چیكـراوی ئـەو هیمایانـەن كەهونەرمـەندو بەرهەمهینـەرانی ئیمەیجـەكان، لەتیكسـتو نیگـاو كلتورەكانی پیش خۆیانەوە بەدەستیانهیناوە. بەلآم دیرۆكی هونەر ئەم چلۆنایەتیانەی لیكنەداوەتەوەو پۆلینـی نـەكردون. بـۆ نمونـە، گرنگـی تیكهەلكیشـرانی تیكست لەخویندنەوەی چیكردنی فۆرمی باوو شیاودا، لەریگەی تیشكخستنە سەر سی تایبەتمەندی جیاوازەوە دەردەكەویت:

١- شـیكردنەوەو لیـ كدانـەوەكانی ئـەمرۆ، ئەزمونـە میژوییـەكانی وەك سـەرچاوەیەك قبولـە كەكاریگـەری لەسـەر هونەرمـــەندی سـەردەمانی دوای خـۆیو هەلبژاردنی فۆرمەكانیان دادەنیت. هونەرمەند بەهۆی هەلبژاردنی فۆرمیك كەپیشتر هەبووە، خۆی قەرزارباری هونەرمەندی سەردەمانی پیش خـۆی دەكـاتو بەمشیوەیە شوینپیی هونەری قۆناغیك لەهونەری قۆناغەكانی دواتردا بەجیدەمینیت. ئەم كاریگەریە هیندە رەنگی داوەتـەوە كەهـەندی لەهونـەر ناسـان، بـۆ نمونە (میكایل باكساندال) ناچار بەدەربرینی ئەم تیۆرەدەكات: دەبی بەدیدەی گۆرانكاریگەلیك لەبەرهەمی هونەرمەند بروانین كە لەنەریتەكانی پیش خۆیـدا ئەنجامیداوە. واتە ئەوەیكە لەروبەری تابلۆیەكدا بەدیدەكریت، ئـەو میراتەیـە كـە لەپشـتە دورەكانـەوە بـۆ هونەرمـەند ماوەتـەوەو تەنـها كـاریك كەهونەرمـەند پییهەلدەستی، بریتیە لەئەنجامدانی رستیك گۆرانكاری بەسەر ئەم میراتانــەدا. كـەوابوو پلـەی هونـەرو ئاسـتی داهینـانی هونەرمـەندیش لەپیوانـەكردنی ئـەم گۆرانكاریانەدا دەردەكەویت. بیگومان تیۆریكی لەم چەشنە، تەواوی یاساكانی میژووی هونەر كەبەردەوام جەختی لەسەر داهینانو هەمەچەشنەیی ریبازەكان كردۆتەوە، دەشیوینیت.

٢- پۆرتریت زیاتر كەمتەرخەمدەبیت بەرامبەر بەو ئەنگیزانەی كەقـەرزیكردنو هیـچ ئاماژەیـەكیان پینـادات. ئەگـەری ئـەوەش هەیـە كەوینـەكیش ئـەنگیزە نیگاییەكانی قەرزكردبیتو كاری بەسەر ماناكانیەوە نەبیت. بەلآم لیكدانەوەكانی ناوەوەی تیكست ئەو راستیە روندەكەنەوە كەئەگـەر هیمایـەك قـەرزكرابیت، ئەوا ماناكەشی لەگەلدا دەبیـتو ناتوانین بەجیا لەهەر كامیكیان بروانین. لەوانەیە مانایەك بگۆردریتو مانایەكی تـر شـوینەكەی بگریتـەوە بـەلآم هـەر لـەم مانا بەدیلەشدا، شوینپیی مانا دیرینەكان وەك خۆیان دەمیننەوەو بەردەوام خۆیان دەنوینن. بەواتایـەكی تـر وەرگرتنـی مانـای نـوی نابیتـە هـۆی سرینەوەی مانای پیشوو.

٣- سیهەمین جیـاوازی بریتیـە لـەو كەسیتیە تازەیـەی كـەزادەی پـەندەكانی نـاو تیكسـتەكەیە. واتـە هونەرمـەند لەریگـەی بەكارهینانـەوەی ئـەو فۆرمانـەی كەلەبەرهەمە دیرینەكاندا هەبوون، ئەواتیكستەكەشیان دەگوازریتەوە ناو بەرهەمەكەی خۆی. ئەم حالەتە، تەنانەت لەوكاتەشدا حاشا هەلنـەگرە كەهونەرمـەند بەتەمابیت لەریگەی ئەم ڤۆرمانەوە بگاتە تیكستیكی تازە. بەكارهینانی حالەتیك كە لەبەرهەمە دیرینو چیكردنی فۆرمەكانی تردا بیندرابیـت، ئـەوا جـۆرە گواستنەوەیەكی مانای ناسنامەش دەگریتەوە. بۆ نمونە ئەگـەر لەبەرهـەمیكدا فیگـەری مرۆڤیكـی شـەرانگیز بەحالـەتیكی تایبـەت وینـەبكریتو لـەقۆناغو سەردەمانی دواتردا، وینەی مرۆڤیكی خیرەومەندو چاكەكار بەهەمان حالەت بكیشریت، ئەوا بـەناچار بەشیك لەئەندیشـەی بینـەر بـەرەو بەرهـەمو ناسـنامە دیرینەكەی كیشدەكریت. مۆنـالیزا فیگـەریكی ناسـراوی هەیـەو ئەگـەر ئـەمرۆ وینـەی ژنیـك بەهـەمان حالـەت بكیشـریت، شـوین پەنجـەی مانـاو ناسـنامە دیرینەكەشی تیایدا رەنگدەداتەوە. كـاتیك (كـورۆ) سیسـەدو هەشـتا سـالٌ دوای لیۆنـاردۆ داڤینشـی، وینـەی ژنیكـی بەهـەمان فیگـەری مۆنـالیزا كیشـا، بەرجەستەترین شت كەتیایدا بەدیدەكرا هەمان ناسنامە گوازراوەكەی بوو. ئەمە هەمان ریسایە كەئـەمرۆ (سـندی شـرمەن) سـودی لیوەردەگریـتو لـەئاكارو روالەتی ئاشنادا وینە لەخۆیدەگریت كەئەمەش دەبتە هۆی ئەوەیكە ریوایەتیكی میژویی لەگەلٌ گوتاریكی هزریدا ئاویتە بیـتو داوجـار راڤـەو تەفسیرەكانی بەرهەمی تازە بخاتە ژیر كاریگەری خۆیەوە.

ژن لەم بەرهەمەی ڤرمیردا، لـەنیو گوتارگـەلی لیكدانـەبراوی ئەزمونـە ئالۆزەكـاندا وەسـتاوە. تـابلۆی "رۆژی حەشـر" كـەجۆرە قەرزكردنیكـە لەنـەریتی دیكانستراكشن، بەروالەت لەگەلٌ چەمكی واقیعگەرایانەدا نەگونجاوەو وەهمی فـەزای نـاو ژورەكـەش پـتر دەكـات، بـەلآم جۆرەتیكهەلكیشـبونیكی تیكسـتو پەیوەندی بینبنی تیكست دەخولینیت. لەگەلٌ هەموو ئەمانەشدا، هەرچەشنە هەولدانیك لەپیناو گریدانی ریوایەتیكی تایبەت بەم بەرهەمەوە بیئاكامدەبیت، چونكە دیمەنە واقیعگەراكانیكورتنابنـەوە بـۆ چوارچیـوەی وینـەی ژنەكـەو ئـەو كـارەش كەئـەنجامی دەدات. لەبەشـی سـەرەوەی لای چـەپی وینەكـەدا، لەسـەر

دیواریکی چەرموو کەتابلۆی "رۆژی حەشر"ی پیوە هەلواسراوە، بزماریك بەدیوارەکەوە داکوتراوەو، لەتەك بزمارەکەشەوە کونیك لەدیوارەکەدا بەدیدەکریت. رەنگە ئەم دوبەشە چکۆلەیە هەر بەرچاویش نەکەون، بەلاّم لەبەر ئەو روناکیەی لەپەنجەرەوە دیتە ناو ژورەکەوە دەرکەوتون، کەرەنگە لەیەکەم نیگادا بەهیمایەکی واقیعگەرایانەو زیدەرۆیانە لەقەلەمبدرین‌و بخرینە ریزی هەمان نەریتی وینەکیشانی سروشتی بیگیان‌و رەنگبزرکاوی هۆلەندیەکانەوە، بەلاّم ناتوانین ئەمە وەك تیکهەلکیشبونی تیکست بینینە ئەژمار، چونکە روناکیەکە، زۆریك لەوردەکاریە کەمبایەخ‌و پر بایەخەکانی تریش دەردەخات‌و، هەر لەم روناکیەدایە کەئاوسبونی ژنەکە ئاشکرا دەبیت، لیرەدا ئەو پرسیارە دیتەگۆری کەبۆدەبی ئەم وردەکاریانە لەروناکیەکی هیندە ناسك‌و رەنگ گەلیکی هیندە سەرنجراکیشدا نمایشبکرین؟ لەمیانەی ئەم پرسیارەوەیە، کەگوتاری فرەمانایی خۆی دەردەخات.

## فرەمانایی:

لەبەرئەوەیکە بینەر بەدیتنی هەر ئیمەیجیك، شتیك لەهەگبەی کلتوری خۆشی تیکەلاّو دەکات، ئەوا هەرگیز ناتوانین باس لەمانایەك بکەین کەپیشتر بیری لیکرابیتەوەو یەکلایەنەو یەکانگیربیت، هەربۆیە هەموو چەشنە پیداگریەك لەمبارەیەوە دواجار دەبیتە گرژی‌و ئالۆزیەکی گالتەجار ئامیز. لەم تابلۆیەدا هەرجۆرە گریدانەوەیەکی حالەتی ئەو ژنەی تەرازویەکی بەدەستەوەیە، بەتابلۆی "رۆژی حەشر"ەوە، کەرۆژی داوەری‌و هەلسەنگاندنی کردەوەی مرۆڤەکان نمایشدەکات، ئەم کارەی ژنەکە هەم دەتوانی شیاوو بەجی بیت‌و هەم دەتوانیت چەشنی ئایرۆنییەکی تال نەشیاوو نا بەجیبیت، چونکە لەرۆژی پاداشتی چاکەو خراپەدا، پەروەردەگار رۆحی مرۆڤەکان دەخاتە تای تەرازوی دادپەروەریەوە کەچی ژنەکەدروستی‌و بیخەوشی تەرازویەك تاقیدەکاتەوە کەبەنیازە زیرو زیوەکانی خۆی پیهەلسەنگینیت.

ئەو مەیدانەیکە مانا جۆراوجۆرەکان تیایدا شەردەکەن، مەیدانیکی کۆمەلاّیەتیە کەخۆی کەوتۆتە ژیر گوشاری توانست‌و بونیادە جۆرەجۆرەکانەوە، لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا یەکیك لەمەیدانەکان، مەیدانی نواندن‌و راڤەکردنی ئەفسانەکانە، شتەکان ئاماژە بەشتیکی سەربەخۆی دەرەوەی خۆیان دەدەن‌و ماهیەتی فرەمانایی نمایشدەکەن. لەم تابلۆیەی ڤرمیردا، سەنتەری نواندن، واتە ژنەکەو ئەورۆلەش کە لەئەستۆیدایە، لەناوەندی تابلۆکەدا نیەو ئەوەیکە لەچەقی تابلۆکەدایەو گرنگی پیدراوە کردەی هەلسەنگاندنە ئەویش لەریگەی تەرازویەکەوە کەهەردوو تاکانی بەتالن. تەرازویەکی بەتالّ ناتوانیت مانا بەکردەی هەلسەنگاندن ببەخشیت هەر بۆیە تابلۆکەش ناتوانیت ریوایەتیکی ژیرانە بەخۆیەوە بگریت، لەم بەرهەمەدا، ئەوەیکە بریارە سەبارەت بەنواندن بیت، خۆی لەخۆیدا شیوەیەك لەنواندن بەخۆیەوە دەگریت‌و مەسەلەیەکی گەورەتر واتا فرە مانایی دینیتە گۆری. لیرەوەیە کەچەمکی تیۆری رادیکالی ژاك دریدا، کەهیچ راڤەیەك لەراڤەکانی دی بەچاکتر نازانیت، متمانە پەیدا دەکات‌و مەسەلەی فرە مانایی بەشتیکی پیویست‌و حاشا هەلنەگر دینیتە ژمار.

ئەو نمونانەی لەسەروە باسمانکردن دەشی لەلایەك جەختکردنەوە لەسەر "فرە مانایی" بیت‌و لەلایەکی تریشەوە سەلمینەری نامەنتیقی بونەکەی بیت هەروەها دیاریکردنی مانایەکی تایبەت بۆ بەرهەمیکی هونەری، شتیکی تژییە لەبیهودەیی‌و، گومانیشی تیدا نیە کەبەردەوام لەژیر گوشارە کۆمەلاّیەتی‌و رامیاریەکاندا بووە، ڤیتگنشتاین لەریگەی هینانە گۆری چەمکی "گەمەی زمان"ەوە پیبوایە کەهیماکان بەشیوەیەکی چالاك‌و کارا دەجولینەوەو ناچارن بەوەیکە هەم لەگەلّ یاساکانی سەردەمی خۆیاندا بگونجین‌و هەم لەگەلّ خەلك‌و کۆمەلگەیەك کەتیایدا بەکاردەهیندرین سازگاربن. کەواتە هەر هیمایەك رواداویکە کە لەباروِدۆخیکی تایبەتی میژویی‌و کۆمەلاّیەتیدا روئەدات‌و لەبەر ئەوەی ماناکەی ناچیتە قالبی هیچ سنورو چوارچیوەیەکی دیاریکراوە وە، ئەوا ئەو بەلینەی لەئەستۆی دایە لەسەدا سەد کۆمەلاّیەتیە. رەنگە هیماکان هەندیجار لەهەلومەرجی تایبەت‌و گونجاو لەگەلّ داب‌و نەریتگەلیکدا کەپیدەچیت لەروی کلتوریەوە جیی متمانەبن، بینە ئاراوە هەر بۆیە پیویستە هەمو چەشنە راڤەو تەفسیرکردنیکیان لەچوارچیوەی گرژییە کۆمەلاّیەتیەکان‌و لەژیر کاریگەری یاسا بگۆرەکاندا ئەنجامبدریت. هەر رەفتاریکی شیاوی پیناسەکردن، یاخود بابلیین شیاوی راڤەکردن، خاوەنی چوارچیوەیەکی کۆمەلاّیەتیەو هەموو چەشنە کردەیەکی شیاوی راڤەکردن، لەسنوری ئەودا روودەدات. لەروانگەی دریداوە ئەم چوارچیوەیە، وەك روپۆشە لاوەکیەکان، زیاتر دەکەونە ناوەوە، نەك دەرەوەی بەرهەمەکە. واتا گەربیت‌و سنور بۆ بلاّبونەوەی چەمکەکان دیاریبکەین، ئەوا ئەم سنوورداریە لەناوەوەی بەرهەمەکەدایە نەك لەدەرەوەیدا.

## گومان لە پیگەی پراو پری مانادا:

بیگومان ئەو بزمارە چکۆلەیەو ئەو کونەی بەهۆی روناکیەکەوە دەرکەوتون، بەهەوەنتەو بی مەبەست وینە نەگراون‌و لیرەدا نەك هەر نیگا، بەلکو ئەندیشەی قولّ‌و بزیویش بەرەو خۆیان رادەکیشن. بەلاّم ئایا ئەم دوو رەگەزە وردو گچکەیە بۆچی لەم تابلۆیەدان‌و دەشی چ پەیوەندیەکیان بەمانای ئەم بەرهەمەوە هەبیت؟ وەلاّمیکیان ئەوەیە کەدەشی وەك دوو رەگەزی بیمانا کەبەشیك لەنواندنی راستەقینەی وینایی لەئەستۆ دەگرن‌و لەبی ریوایەتی تابلۆکەدا رۆلیکی ناریوایەتیانە دەگیرن، لەقەلەمبدەین. بەلاّم ئەمە نیشانەی بیرکردنەوەی ساویلکانەیە. ئایا ئەم دورەگەزە بەشیوەیەکی سومبولیانە ئاماژە بەبایەخی "رۆژی حەشر"و وینەی ژنەکە نادەن؟ بەواتایەکی تر ئایا پەیوەندی هەنوکەیی نیوان تابلۆی "رۆژی حەشر" بەوینەی ژنەکەو ئەو کارەش کەئەنجامی ئەدات،

بیسر بەشیوەیەکی تر بووە؟ گەر هاتباو تابلۆکە بەم بزمارە یاخود نەختی ئەولاترەوە واتــە بەشـوینی ئـەو کونـەی کەپیشتر بزمـاری تیـا بـوە، هەلبواسـرایە، لەدەستدانـە ناوەندی وینەکـەوەو یارمـەتی یەکسـانی نیگـایی نەئـەدا؟ لەحالـەتی ئیسـتایدا ژنەکـە دروسـت لـەژیر وینــەی پــەروەردەگاردا وەســتاوە ئەمــەش جەختکردنەوەیە لەسەر پەیوەندی نیوان داووەریو هەلسەنگاندن، وەلی سەری ژنکە بەجۆریك ئەو بەشەی تابلۆکـەیدا پۆشـیوە کەلیکجیاکردنـەوەی فریـادرەسو گوناهکارەکان مەحالەو بەشیوەیەکی سومبولیانە ئاماژە بەو راستیە دەکات کەسنوری نیوان چاكو خراپ، بەتالە موویەکەوە بەندە. بەلاّم کـاتی دەسـتەویەخە بوون لەگەلّ ئەو مانایانەدا، واتە دروست ئەو دەمەی کەپیمانوایە لەماناگـەلی شـیاو نزیکبوینەتـەوە، بیرماندەکەویتـەوە کـە لەتابلۆیـەکی هونـەرییو رەنـگو روناکیو هاوسانی نیگاییو شیوەکاریی دەنۆرین نەك لەژوریکی راستەقینەو رووداویـك کەئـەم هـەموو راڤـەو تەفسـیرە هـەلبگریت. ویـرای هـەموو ئەمانـەش دلەراوکی دەستبەردارمان نابیت. ئەگەر ئەمەتەنها تابلۆیەکەو مەبەست نمایشکردنی رەنگو تیشكو یەکسانی نیگاییانەیـە، ئـەوا وینـەکیش چ پیویسـتیەکی بەدەرخستنی ئەم بزمارو کونەکەی تەنیشی هەبوە؟ ئایا لەکاتی تۆمارکردنی ئەم دیمەنەدا شـوینی تـابلۆی "رۆژی حەشـر"یشـی گۆریـوە؟ ئایـا بەرلـەوەی ئـەم تابلۆیە بـەم شـوینەوە هەلواسـیت ، دواتـر شـوینی هەلواسـینەکەی گۆریـوە؟ واتـە سـەرەتا بەشـوینی کونەکـەوە هەلواسـراوە، پاشـان بەبزمارەکـەوە، دواجـار گوازراوەتەوە شوینی ئیستای؟ ئەگەر ژورەکە ژوریکی راستەقینە بوایە، ئەوا دەکرا بەهۆی ئەوکونو بزمارەوە ئەوە قبولبکریت کەپیشتر تابلۆکـە بـەدیواریکی ترەوە یاخود وینەکیشەکە لەژوریکی ترەوە گواستویەتیەوە بۆ شوینی ئیستای. باشە، ئەم هــەموو وردەکاریانـە بۆچـی، ئـەم تابلۆیـە کەبـەم شـیوەیە یەکسـانی خامەکە تیکدەدات، واتە لەخامیکدا کەبابەتە سەرەکیەکەی یەکسانیو هەلســەنگاندنە، رۆلیکـی تیکدەرانـە دەگـیریت. بـەلاّم ناچـارین گـوی لـەو راسـتیەش بگرین کە لەم تابلۆیەدا یەکسانی نیگای گرنگ نیە. ئامانجی سەرەکی لەم تابلۆیــەدا نمایشـکردنی پـەیوەندی سـومبولیانەی نیـوان داوەریو ئـەو کارەیـە کـە ژنەکە ئەنجامیدەداتو، هەر ئەم یەکسانیە ئەندیشەییە، لەلایەك یەکسانی نیگایی دەگەیەنیتو لەلایەکی ترەوە تیشکدەخاتە سـەر ئاسـتەنگی فەراهـەمکردنی سـازگاری لـەنیوان "هەلسـەنگاندن"و "داوەریکـردن"دا. هەنوکـە ئاسـتەنگیو دژواری فەراهـەمکردنی یەکسـانی لـەنیوان داوەری هـزریو هەلســەنگاندنی بابەتیانەدا، شیوەی سومبولیانەی دژواربونی خولقاندنو کیشانی وینەکە بەخۆیەوە دەگریت. یەکسانی تابلۆکە خۆی بەهیلّو سەنتەری وینەکەوە نەبەسـتۆتەوە، ژنەکە ئاوسەو یەکسانی تەواوەتی ئەو دەمە دیتەدی کـەمندالیك لـەدایکبیتو لەبـەکارهینانی رەگـەزەکانو فـەزای وینـەکـەدا رۆلـی هـەبیت. کەواتـە تـەواوی تیکستو باکگراوندی چیرۆکی تابلۆکـە لەسـەر بنـەمای تیکسـتیکی پیشـوەختی میژوییو بیۆگرافیانەوەیە. بەواتایـەکی تـر تیکسـتی تابلۆکـە، هـەروەك لەدایکبونی منالّ، زادەی یزدانی راستیە. بینەر دەتوانی لەتابلۆکە بروانیتو گوی بۆ ریوایەتە ساکارەکەی شلبکات، هەروەك چۆن کردەی داهینانی هونەریو وینەکیشانەکەشی هەلقولاّوی بینینو بیستن بووە. بەرهەمیك کەپیدەچیت لەهەمووچەشنە بیرکردنەوەیـەکی پیشـوەختو مەبەسـتی سـەرەکی جیـا کرابیتـەوەو فۆرمیکی ساکارو سەرەتایی بەخۆیەوە گرتبیت.

ئەوەی تائیرە گوتراوە پیدەچی شیاوی قبولکردن بیت، بەلاّم گومان لەوەدا نیـە کەئەمـە جـۆرە دلخۆشـکەریەکی نیگاییانەیـەو نـاتوانی بنـەمادارو جیـی متمانەبیت چونکە بەناچار ئەم پرسیارەش دینیتە گۆری کە لەبەرچی وینەکیش لەبری گواستنەوەی تابلۆی "رۆژی حەشر"، شـوینی وەسـتانی ژنکـەو گۆشـەی تیرشوانینی خۆی نەگۆریوە؟ بەرجەستەکردنی ئـەم پرسـیارە رووداویکـی چاوەروانـنـەکراوی بەدواوەیـە. لـەپریکدا تـەواوی دیمەنەوشكو بیدەنگەکـە دەخرۆشـیت بیدەنگی دەشـکیتو بینـەر هەسـتدەکات وینەکیشـەکە دەکەویتـە جولـە تـاکو گۆشـەی تـیروانینی خـۆی بگـۆریت، ژنەکـەش دەجولیـتو چـەند هـەنگاویك لەملاترەوە دەوەستیت.

ناتوانین هیچ مانایەکی فرۆماتیکیانە بەم بزمارو کونە ببەخشین، وەلی گومانیشی تیـدا نیـە کەبزمارەکـە چەشـنی چەخماخـەیك ئەندیشـەی بینـەر وەگـەر دەخات. بینــەر بـەر لـەدیتنی ئـەم کـونو بزمـارە، بەدلەرواکییـەکی کـەمترەوە لەتابلۆکـەی دەروانـی، بـەلاّم ئیسـتا بـەهۆی زانیـاری لەسـەر دیکانسراکشـنی پۆستمۆدیرنیستیانەوە، دەتوانـی لەروانگەیـەکی بـەرفرە تـرو تـیروانینیکی پیشـکەوتوانە تـرەوە لەتابلۆکـە بروانیـت. بەمچەشــنە بەرهەمــە هونەریەکــەش لەگۆشەنشینی دەرباز دەبیتو چیدی تەنیا نابیت چونکە ئەندیشەی بینەر ئاویتەی دەبیـت. ئیسـتا "ژنو تـەرازوو"ی ڤرمـیر وەسـتاوو بـی جولـە نیـە، ئەگـەر ریوایەتیك دەرنابریت، هیندە هەیە کەخۆی ریوایەتی خولقانی خۆی دەگیریتەوە.

شایانی باسە کەدیکانستراکشنی ئەم نواندنە نیگاییە تەنها کاتیك دەسـتەبەر دەبیـت کـەوەك تیکسـتیکی نوسـراوەیی بخویندریتـەوە ئەمـەش چارەنوسـی نەگۆری هیما نیگاییەکانە کەبەردەوام بژیوی خۆیان لەیزدانی ئەدەبیاتەوە هەلدەمژن. بەهەرحالّ ئـەم خویندەوەیـەش هـەروەك خویندنـەوەی ئـەدەبیات، شـیعر، میژووی هونەرو هەر ریوایەتیکی تر، ئەگەر لەریگەی تیروانینو شیوازیکی دیکانستراکشنیانەوە بیت، ئەوا ماناو راڤەو تەفسـیرەکان دەگـۆریـتو تیکسـتیکی جیگرەوە فەراهەمدەکات.

## پەراویزەکان

* گالیڤەر: ئەو کەسیتییە سینەماییەیە کە هەندیکجار دەکەویتە ناچەیەکەوە مرۆڤەکانی لەچاو ئەودا گرگنو قەزەمنو هەندیکجاریش دەکەویتە ناوچـەی واوە کـەخۆی لـەچاو ئـەواندا گرگنو قەزەمە.

١- سەرەرای ئەم نمونانەش، نوسەرانی وەك (نستۆرگارسیا کانسلینی، میرکۆلایر، جرار دۆ مۆسکۆیرا، گۆیلەر موگومزیناو ماری کامرۆن)یش هەرکام رۆلی کلتوریان گیراوە.

٢- لەبابەتێکدا لەژێرناوی "کارنامەء کرامین سال؟" لەگۆڤاری ئادینەی ژمارە ١٢٦/١٢٥ی نەورۆزی ١٣٧٧، کردوەو تایبەتمەندیەکانیم رونکردۆتەوە.

٣- گاردین ١١/١/١٩٩١ (The Reality Gulf)

٤- لیبراسیۆن، ٢٩ی مارت ١٩٩١.

٥- ڤالپۆل (١٧٤٨)...و بەشەکانی مالی بەمۆدیرنیزەکراو.

٦- تری ئیگلتۆن لەکتێبی (Capitalsm, Modernism and postmodernism) پیێوایە کەپارۆدی مۆدیرنیستیانە نەك هەر روکەشە، بگرە کیچیشە، چونکە ئاماژەکانی بۆ مێژوو، نەنۆستالجیك و نەئیستاتیکیانەیە، کانت فرامپۆنیش لەکتیبە سەرنجراکیشەکەیدا بەناوی

Twards a critical Regionalism، نەبونی شیاویتی دابەزین بۆ توخمگەلی رازاندنەوە، بەبەلگەکانی جیمسۆن و ئیگلتۆنەوە زیاد دەکات.

٧- جراردۆ مۆسکۆیدا، کیچ وەك "سەلیقەی خراپ لەفۆرمی چاکدا" پیناسە دەکات.

٨- Avant- Gard and Kitsch(١٩٣٩) کە لە Partisan Review لەچاپدرا. گرینبیرگ ئەوەیکە لەگەڵ مۆدیرنیزمەکەی ئەودا کۆك نەبوایە بەکیچ ناویدەبرد. ئەم بابەتە لەیەکەمین بەرگی کۆمەلە بابەتەکەیدا بەناوی Perceptian and Judgment(١٩٨٦)، هاتوە.

٩- بابەتی سلستی ئۆلال کۆئیا، کەلەژیر ناوی (Beyond the fantastic) "١٩٩٥" هاتووە، یەکیکە لەسەرچاوە، بەهادارەکان بۆ خویندنەوەی ئەم دیاردەیە، کەتیایدا بەنیگایەکی وردبینانەوە لەروخسار نیگاری کیچ دەکۆلیتەوە.

١٠- بابەتی Notes on Camp(١٩٦٤) نوسینی سۆزان سونتاگ، کە لەکۆمەلە بابەتەکەیدا، Against Interpretion(١٩٩٦) هاتووە، یەکیك لەسەرچاوە گرنگەکانە بۆ ناسینی ئەم ئیستاتیکا گرویچیتیە.

١١- بۆ نمونە تایبەتمەندیی بونیادگەریی (لیڤی ستراس)، تویژینەوەی بونیادگەلی نەگۆرو هاوسەنگ، یاخود هەماهەنگیەکانی فۆرمیکە کەلەسروشتی خودی مرۆڤدا رەنگئەداتەوە.

١٢- سەرەرای لیڤی ستراس، (ژاك دریدا)ش لەو باوەرەدایە کەهیچ پنتیکی کۆتایی لەمیژودا نییە هەروەها میشیل فۆکۆ لەکاتی نوسین لەبارەی میژووەوە، هیچ جۆرە راوبۆچونیکی گەشەکردن لەبەرچاو ناگریت. یەکیك لەمەسەلەکانی دریداو میشیل فۆکۆ ئەوەیە کەهچیکامیان لەم رەهەندە تایبەتەدا، "تیۆری گەوهەورزات" یان نییە بەلام نوسینەکانی لاکان لەسەر بنەمای ئەم تیۆریەو هۆکارەکەشی کاریگەریی وەرگرتنیتی لەفەلسەفەی هیگل و ئەو بەلینەی کەلەبەرامبەر دەرونزانیدا هەیەتی. بۆ خویندنەوەی زیاتری ئەم رەهەندە، کتیبی The Sayagamind (١٩٩٦) نوسینی لیڤی ستراس، هەروەها خویندنەوەی تیۆریەکانی ساسۆر، بلوم فیلدو بەتایبەتیش ئەوەی کەچۆمسکی "بونیادگەری روکەش"و "بونیادی کاکلدار" یارمەتیدەر دەبیت.

١٣- Ths Precession of Simuiacra (١٩٨٤)، ناونیشانی یەکیك لەکاریگەرترین ئەو بابەتانایە کەبۆدریار لەمبارەیەوە نوسیویتی. بۆدریار بەتیروانینیکی دۆزەرەوانە، کەگوێ بەجیاوازیەکان نادات، جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە، کەمیدیاکان راستەقینەیان پوچەلکردۆتەوە. بۆدیارد ئەمەی ناونا Simulacyizatono.

١٤- داریوشی ئاشوری هاومانای (خودبردار) (خۆگەر)ی لەفەرهەنگی زانستە مرۆییەکاندا تۆمارکردووە، هەروەها هاومانای (فرمانیك) لەبەرامبەر فەرهەنگۆکی کتیبی "سرگشتگی نشانەها" سەرگەردانی هیماکان (١٣٧٤)دا هاتووە.

١٥- لەدانانی ئەم هاومانایەدا خۆم قەرزاری رینوینی و هاوفیکریی "ئەکبەر مەعسوم بیگی" دەزانم.

١٦- ئەو بابەت و نامیکانەی کەدریدا دەربارەی دیکانستراکشن نوسیونی بریتین لە: Otabiographies (١٩٤٥) ئەم بابەتە یەکیکە لەچروپرترین بەرهەمەکانی دریدا. لەبەشیکیدا تیشکدەخاتە سەر بەیاننامەی سەربەخۆیی ئەمەریکاو ئەو پرسیارە دینیتە گۆری کە چ شتیك ئیمزای ئەوکەسانە پیشتراستدەکاتەوە کەلەسەرەتادا ئەو بەیاننامەیان ئیمزا کردوە؟

١٧- بەشیك لەگوتاری دیکانستراکشن بەندە بەرەخنەی نیتشە لەبینای سیستماتیکیانەی فەلسەفەی هیگلەوە، نیتشە وای بۆدەچووکە لەهەلە جۆراوجۆرەکاندا بۆ گەیشتن بەحەقیقەت لەریگەی مەنتیق یاخود ئەقلی تەجریدی، رستیك هەلەو چاوپۆشیکردن پەیرەوکراوە.

١٨- پۆلدمن، کەیەکیکە لەبنیاتنەرانی دیکانستراکشن رایوایە کەئەندیشەو مانا بەتەنها لەقۆرغی تیکست و بەرهەمی هونەریدا نییەو بەشیکی لەرەخنەو فەلسەفەی هونەردایە.

سەرچاوە:

تبارشناسی پست مدرنیزم- اصول ومبانی پست مدرنیزم - چاپ اول١٣٨٠/ص١٥-٥٥